

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي

MediaAmeerOffice

AliBapir/عەلی باپیر

AliBapirw/عەلی باپیر

AliBapir1

archive.org/details/@alibapir

AliBapir/عەلی باپیر

AliBapir

Google Pay

App Store

AliBapir / عەلی باپیر

www.alibapir.net

کوردی - عربي - English

ڕاگەیاندنی مەکتەبی ئەمیر

# تاقیکردنەوەی خوا جل جلاله بۆ بەندەکانی چییە و چۆنە؟!

www.alibapir.net

# تاقیكردنەوەی خوا جل جلاله

# بۆ بەندەكانی چییە و چۆنە ؟!

عەلی باپیر




بۆ بڵاوكردنەوە و ڕاگەیاندن

www.alibapir.net

ناوی کتێب: تاقیکردنەوەی خوا جل جلالە بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟!
نوسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نەخشەسازی ناوەوە: عزالدین محمد عمر
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٠٦٦)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com
Mob:0750 460 51 22
Tel: 066 25 18 138

www.al-tafseer.com

چاپکردنی ڕەشنووسی کتێبەکانم بەم شێوەیە بە گوێرەی توانا و هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو.

وە لە پێشتر بوو هیوادارم وا بوو شێوەی چاپکردنێکی والیا بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری خوێنەران بێ. جارێ تا سوپاسی خوای بەخشەر دەکەم لە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ. خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان بێت، هەمیشە سوپاسیان دەکەم.

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (عەلی باپیر) بەڕێز ماموستا مخلص و

نووسینگەکەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و پێزی زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچکەسێکی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦ھ

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

# نێوەرۆك



﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ العنكبوت.

**بەناوی خودای بە بەزەیی بەخشندە**

**ئەلیف، لام، میم ﴿١﴾ ئایا خەڵك وادەزانن هەر كە گوتیان: بڕوامان هێنا، وازیان لێدەهێنرێ‌و تاقی ناكرێنەوە؟ ﴿٢﴾ بێگومان ئەوانەی پێش وانمان تاقیكردەوە، وە سەرەنجام (پاش تاقیكردنەوە، هەروەها پێش ئەوەش) خوا ئەوانەی ڕاست دەكەن دەزانێ، وە ئەوانەی كە درۆزنن دەیانزانێ ﴿٣﴾.**

# پێشەكی چاپی دووەم

الحمد لله حق حمده والصلاة والسلام على عبده محمد النبيّ الأميّ وآله السائرين على دَرْبِهِ.

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!

بە سەرنجدانی واقیعی ژیانی دونیاو، قورئانو سوننەتو سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆمان دەردەكەوێ كە تاقیكردنەوەی مرۆڤ لەلایەن خوای پەروەردگاری كاربەجێو زاناوە، بە گشتیو تاقیكردنەوەی مرۆڤی بڕوادارو كۆمەڵی بڕوادار بەتایبەت، ڕاستییەكی درەوشاوەی نكووڵیی لێنەكراوەو یەكێكە لە یاساو سوننەتەكانی خوا سبحانه وتعالى لە ژیانی مرۆڤدا.

ئەم كتێبەی بەردەستیشت، كە نزیكەی دە (١٠) ساڵ لەمەوبەر بۆ جاری یەكەم چاپ كراوەو لە مێژبوو لە كتێبخانەكاندا نەمابوو، لەسەر داواو پێشنیاری چەند دڵسۆزێك بە باشمان زانی چاپی بكەینەوە، تەرخانكراوە بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتە گرنگو هەستیارە، كە هەمیشە زیندوویەو جێی قسەو باس لەسەركردنە.

شایانی باسیشە، ئەم كتێبە لەم چاپی دووەمەیدا كتو مت وەك خۆی هێڵراوەتەوە، جگە لە دەستكاریی چەند ڕستەیەكی كەمو زیادكردنی چەند پەراوێزێك.

هیواداریشم، كە ئەم بەرهەمە لە بواری خۆیدا "هەرچەندە كورتو گوشراویشە" بەرچاوڕوونییەكی باشی تێدابێ بۆ هەموو

لایـەك بەگـشـتیو بەتایبـەت بـۆ كەسـانێك، كـە لـە مەیـدانی كـارو چالاكی ئیسـلامییدا لەگەڵ سـەختییو دژوارییو گرفتـاریی یەكانـدا دەستەو یەخەن.

والسـلام علينا وعلى عباد الله الصالحين الصابرين الشـاكرين

نووسەر

١٩ جمادي الثانية ١٤٣٢

٢٠١١ /٥/٢٢

# پێشکەش بێ

بەو کەسانەی کە لە تاقیکردنەوەکانی خوادا خۆڕاگر دەبن و، لە کوورەی جەڕبێنرانی جۆراو جۆردا سەربەرزانە لە کڵ دەردەچن و، لە سۆنگەی پاکیی مەعدەنیانەوە ڕووسووری ئێرەو سەرفرازی ئەولا دەبن.

# پێناسەی ئەم کتێبە

خوێنەرە بەڕێزەکان!

ئـەم کتێبـەی بەردەسـتتان لـە ئەسـڵدا بریتییـە لـە یـەکێك لـە وتارەکانی بەندە کە لە شاری سلێمانیو لـە مزگەوتی جیهاددا دراوە، لـە رۆژی: (١٩ ی موحـەڕڕەمی ١٤٢٢ ك) بەرانبـەر بـە (١٣/٤/٢٠٠١ز) پاشـان بـرای بـەڕێزم: مامۆسـتا (فـەرەح مـەحمود عەلـی) وەك خـۆی لەسـەر کاسێتەوە هێناویەتـە سـەر کاغـەزو پـاش چاوخـشاندنەوەو سووکە دەستکارییەکی خۆیشم بۆ هەنـدێك وشـەو تەعبیـری، بـرای بەڕێزم: مامۆستا (مەلا بیلال قـەڵادزەیی)یش دووبـارە بـە خـەتێکی خۆش نووسیویەتەوەو ئامادەی چاپی کردوە، خوا پاداشتی هەرە باش بـەو دوو بـرا بـەڕێزەم ببەخـشـێ‌و، سـوپاسـیان دەکـەم‌و خـوا وێنەیان زۆر بکات.

پاشـان بـە پەسـەندو بگـرە پێویستیـشم زانـی، کـە دوو بابـەتی دیکەش لەبارەی تاقیکردنەوە (الإبتـلاء)وە بخەمـە گـەڵ ئـەم وتـارە، کە بریتین لە:

١- (حـەوت ڕاسـتیی گـرنگ) جـا هەرچـەندە هەنـدێك لـەو حـەوت ڕاسـتییە تاڕادەیـەك لێکـچوونیان لەگـەڵ بەشـێك لـە خاڵـەکانی وتارەکەدا هەیە، بـەڵام هـەموویان شـتی تـازەو بـاس نەکراویـشیان هەر تێدایە.

٢- (سێ ئاگاداریی پێویست) ئەمانیش بریتین لە سێ تێبینیو ئاگاداریی بۆ بەهەڵەدا نەچوون لە چەمكو واتای تاقیكردنەوە (الإبتلاء)دا، بۆ ئەوەی هەركەسێك دووچاری هەر بەڵاو كێشەو گرفتێك بوو، خەیاڵی وانەبێ كە ئەوە دەبێتە مایەی كەفارەتو پاكبوونەوەیو لە خوا نیزیكبوونەوەی! بێئەوەی سەرنج بدات، كە داخۆ، لە چ ڕێیەكەوەو بە چ هۆیەكو لە چ هەلومەرجێكدا تووشی بووە!

كەواتە:

ئەم نامیلكەیە سەرەنجام بۆتە سێ بەش:

١- حەوت ڕاستیی گرنگ لەبارەی تاقیكردنەوەوە.

٢- سێ ئاگاداریی پێویست، بۆ ئەوەی لە تێگەیشتنی چەمكی تاقیكردنەوەدا بە هەڵەدا نەچین.

٣- دەقی وتارەكەی مزگەوتی جیهاد.

خوایە بە بەزەییو بەخششی بێسنووری خۆت، ئەم بەرهەمە بكەیتە مایەی بەرچاو ڕوونی زیاتری مسوڵمانان لەبارەی تاقیكردنەوەوە، هیدایەتیشمان بدەی كە هەمیشە سەربەرزانە لە بەڵاو گرفتارییەكان دەربچین.

والحمد لله أولاً وآخراً و باطناً وظاهراً

٢١ی شەعبان ١٤٢٣ك

٢٠٠٢/١٠/٢٧ز

ئەحمەد ئاوا

خوێنەرە بەڕێزەكان!

سەختییو دژوارییئەم هەلومەرجو واقیعە، كە میللەتی مسوڵمانی كوردستانو عێراقو سەرجەم میللەتانی مسوڵمانیش لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامدا پێیدا تێدەپەڕن، لە كەستان شێردراوە نیە.

وە بەندە پێیوایە، كە بارودۆخو واقیعی هێندە سەختو زەحمەتو ئاڵۆز، كەمتر وایە بەسەر ئۆممەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتبێ !

جا بە پێویستم زانی، كە ئەم حەوت ڕاستییە گەورەو گرنگە لەبارەی تاقیكردنەوەی خوا ﷻ بۆ بەندەكانی (إبتلاء الله لعباده) بخەمە ڕوو، كە هەركامێكیان تیشكێكی دیكە - وێڕای وتارەكە - دەخاتە سەر ئەو بابەتە گرنگو هەستیارە:

## یەكەم: خوا ئینسانی بۆ بەندایەتی كردن خوڵقاندووەو بەندایەتی ئینسانیش بۆ خوا لە میانەی تاقیكردنەوەیدا دەبێ:

بەڵێ خوێنەرانی بەڕێز!

ئەم ڕاستییە ڕاستییەكی یەكجار گەورەو گرنگە، ئەگەر نەڵێین: گەورەترین ڕاستییە لە ژیانی مرۆڤدا، خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦ ﴾الذاريات، واتە: وە جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروستكردوون، كە بمپەرستن.

ئاشكراشە، كە خوای پەروەردگارو بێوێنەو بێ نیاز، هیچ پێویستی بە پەرستنو بەندایەتی هیچكەس نیە، بەڵكو ئەوە دروستكراوەكانن، كە بەندایەتی بۆ خوا كردنیان پێویستەو مایەی

سەرفرازیی‌و ئازادیی‌و بەختەوەریی راستەقینەیانەو، بەبێ خواپەرستن‌و بەندایەتی بۆ خواکردن گیرۆدەی دەردی کوشندەی:

بتپەرستیی‌و کۆیلایەتیی کردن بۆ دروستکراوەکان دەبن.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە خوای کاربەجێ ﷻ ویستی وا بووە، کە ئینسان بە ئیرادەی ئازادانەی خۆی بەندایەتی بۆ خوا بکات، تاقیکردنەوە (إبتلاء)کەی بۆتە شتێکی پێویست‌و حەتمیی، هەربۆیەش خوای بەرزو مەزن لە سەرەتای سووڕەتی: (الأنسان)دا ئەو دوو مەسەلەیەی پێکەوە باسکردوون: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾ الإنسان، واتە: ئێمە مرۆڤمان لە تۆرەمەیەکی تێکەڵ دروستکردوە، چونکە تاقی دەکەینەوە، بۆیە گێڕاومانە بە بیسەرو بینەر، ئێمە ڕاستە ڕێمان پێشانداوە، جا سوپاسگوزار بێ یان سپڵە.

## دووەم: سروشتی ئیسلامیش تاقیکرانەوەی مرۆڤ دەکاتە شتێکی حەتمیی:

بەڵێ ئیسلامێك کە تاکە بەرنامەی پەسەندکراوی خوا بێت بۆ ژیان‌و گوزەرانی ئینسان: ﴿...ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ....﴿٣﴾﴾ المائدة، وە ئیسلامێك کە بۆ ئەوە نێردرابێت کە فەرمانڕەوایی بکات‌و بە کەمتر

لە سایەو سێبەر بوونو (حاکم)بوون ڕازی نەبێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ... ﴿٢٨﴾ ﴾ الفتح، وە ئیسلامێك كە هەمیشە پەیڕەوانی خۆی لەسەر نەفس بەرزیی پەروەردە دەكاتو بەرەو عیززەتمەندییو باڵادەستیی هانیان دەدات: ﴿ ... وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المنافقون.

بەڵێ ئیسلامێکی وا کە دەیەوێ کاڵای پڕ بە باڵای ژین بێتو، لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەراندا ڕێنمایی تاكو كۆمەڵ بكاتو، سەرجەم كاروبارە تاكییو كۆمەڵییو مادییو مەعنەوییەكانیان بۆ ڕێك بخات، بە تەئكید شوێنكەوتووانی دووچاری تاقیكردنەوەی جۆراوجۆر دەبن، بەهۆی تێكگیرانیان لەگەڵ سیستەمی حوكمڕانیی تاغووتەكانو، هەواو ئارەزووی نەفامەكانو، بەرژەوەندیی ناڕەوای خۆشگوزەرانەكانو، ڕێچكەو بیردۆزەكانی شەیتانەكانو... هتددا، چونكە ئەوان نایانەوێ دەستبەرداری ستەمو ئارەزوو و بەرژەوەندییەكانی خۆیان بن، ئیسلامیش خوا ناردوویەتی كە باڵادەستو زاڵ بێو خاوەنی قسەی كۆتایی بێت، بۆ یەكلاییكردنەوەی سەرجەم مەسەلە گرنگو چارەنووسسازەكان، ئنجا وەك گوتراویشە، (سەری دوو بەرانان لە مەنجەڵێكدا ناكوڵێت) !

## سـێیەم: سروشـتی ئـەهلی کـوفریش هۆکـارێکی گرنگـی تاقیکردنەوەی مسـوڵمانانە :

بەڵێ خوێنەرە بەڕێزەکان!

یـەکی دیکـە لـەو هۆکارانـەی کـە سـەرهەڵدانی تاقیکردنـەوەو گرفتاریی بۆ مسـوڵمانان دەکەنە شتێکی مسۆگەر، سروشتو پێکهاتەی عەقڵییەتو نەفسییەتی ئەهلی کوفرە، بـە تایبـەت زلـە زلـە ملهوڕو خۆبەزلگرە خۆشگوزەرانەکانیان، با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین تاکو بزانین ئەو ڕاستییە لە قورئانیدا چەند بەڕوونیی ڕاگەیەنراوە:

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ المؤمنون.

﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزخرف.

﴿ ...وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ... ﴿٢١٧﴾ ﴾ البقرة.

﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ... ﴿١٢٠﴾ ﴾ البقرة.

کەواتە: با هیچکەس لە مسوڵمانان خەیاڵی وانەبێ، کە دەتوانێ مسوڵمانێکی سەلامەتو بێ بەڵاو گرفت بێت، لە حاڵێکدا، کە چەندان تاغووتی ملهوڕ سەرزەمینی، خوایان کردۆتە گۆڕەپانی خۆبادانو تەراتێنیانو، گەمەو یاری بە چارەنووسو خێرو بێری سەدان ملیۆن کەس دەکەن!

هەڵبەتە قسەم لەو کەسانە نیە، کە زەلیلانە بۆ ئەهلی کوفرو دیکتاتۆرەکان تەسلیمو دەستەمۆ دەبنو، دەستبەرداری هەموو شتێکیان دەبن!!

## چوارەم: سروشتی مرۆڤیش تاقیکردنەوەی مرۆڤ پێویست دەکات:

ئینسان لەم بوونەوەرەدا خاوەنی کەسایەتییو سروشتێکی تایبەتییو ناوازەیە، کە خوای کاربەجێ بە مەبەستی گونجانی بۆ تاقیکردنەوە، سروشتی ئینسانی وا هەڵخستوە، کە وەك تیغێکی دوو دەم (سیف ذو حدين) بە هەردووك دیوی خێرو شەڕدا ببڕێو، بتوانێ هێندە بەرەو بەرزو بڵندی بڕوات، هەتا لە حوكمی چاواندا نامێنێو، هەروەها بۆ نزمبوونەوەو شۆڕبوونەوەش، بەهەمان شێوە، وەك خوای پەروەردگارو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ
ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ
﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟
يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ

﴿ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٦﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي
عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾ المطففين.

بەڵێ، تاوانباران ناویان لە لیستێك دا تۆمار كراوە، كە لە ژێری هەرە ژێرەوەیەو، چاكەكارانیش بە پێچەوانەوە ناویان لە لیستێك دایە كە لەسەری هەرێ سەرەوەیە!

هەروەها خوا تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ
أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ ﴾ التين.

جا ئەم بەرزبوونەوەو شۆڕبوونەوەی ئینسان كە مەیدان‌و گۆڕەپانی تێدا جەربێنرانەكەیەتی، بەرهەم‌و زادەی ئەو جۆرە كەسایەتیی‌و سروشتە تایبەتییەیە، كە خوای كاربەجێ پێی بەخشیوەو لەسەری سروشتاندوە، كە بێگومان ئەو سروشتە ناوازەیەی مرۆڤ وەك قرژاڵ (سرطان)ێكی دووسەرە وایە، كە لە بارانی‌دا هەیە بە هەردووك باری خێرو شەڕدا بڕوات‌و بێت‌و بچێ:
﴿ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا
﴿٩﴾ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس.

جا ئینسان هەر لە خودی خۆیدا پێش كارتێكەرە دەرەكییەكان (المؤثرات الخارجية)، لە كێشمەكێش‌و بێنەوبەرەدایەو هەمیشە هەر لەنێو خودی خۆیدا بەرەی هەق‌و باتیڵ، لەبەر یەك دامەزراون‌و سەرگەرمی دەبەرێك راچوون‌و یەكترهێنان‌و بردنن، بۆیە مەحاڵە مرۆڤ هەتا لەم ژیانە دنیاییەدا بێت‌و خاوەنی ئەو سروشتە دووسەرەیە بێت، بتوانێ پشتێنی لێبكاتەوەو ئیسراحەت بكات‌و

چەکی تێکۆشان‌و خەبات فڕێ بدات، ئەگەر هەر تەنها خۆیشی بێت !
هەربۆیەش خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ۝٦ ﴾ الانشقاق، واتە: ئەی ئینسان! بێگومان تۆ هەتا دەگەیە پەروەردگارت، سەرگەرمی ڕەنجدانی، وە پێشی دەگەی.

## پێنجەم: ئینسانی مسوڵمان‌و کۆمەڵی مسوڵمان بەبێ تاقیکردنەوە سەخت‌و دژوارەکان پوخت‌و کامڵ نابن:

بەڵێ بە سەرنجدانی ئایەتەکانی قورئان‌و ژیان‌و گوزەرانی بۆ خوا صوڵحاوانیش، بە درێژایی مێژوو، زۆر بە ڕوونیی بۆمان دەردەکەوێ، کە تاقیکردنەوەکان مەرجی پێویستن بۆ گەیشتن‌و کامڵ بوونی ئینسانی مسوڵمان‌و کۆمەڵی مسوڵمان، بابزانین چۆن؟!

خوای پەروەردگار لەبارەی ئەو تاقیکردنەوە سەختەی کە بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی دا خوا لێیان ڕازی بێ هات، لە جەنگی (ئوحود)دا فەرموویەتی: ﴿ ...وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ... ۝١٥٤ ﴾ آل عمران، واتە: وە بۆ ئەوە "ئەو بەڵاو تاقیکردنەوەیەتان بەسەر هات" کە خوا ئەوەی لە سینەکانتان دایە تاقیی بکاتەوە، وە ئەوەش کە لە دڵەکانتان دایە بیپاڵێوێ...

کەواتە: تاك تاکی مسوڵمانان لە گەرمەی بەڵاو گرفتاریی‌و تاقیکردنەوەدا جەوهەرو مەعدەنەکەیان بە تەواوی کەشف دەبێت‌و

کاکڵو نیوەڕۆکیان دەزانرێو، ئەوەی کە لە سینەو هەناوو دڵو دەروونیاندا پەنهانیان کردوەو حەشاریان داوە، دەکەوێتە گۆڕێو لێفە لەسەر هەتیوانیان لادەچێ !

ئەمە بۆ تاك تاكیان و بۆ وەدەرکەوتنو خرانەڕووی ناخو هەناوی هەرکامێکیان وەك خۆی، کە خوای کاربەجێ ئا ئەو دەرکەوتنو کەشف بوونەی نهێنیو ڕازەکانی نێو سینەو دەروونی هەرکام لە مسوڵمانان، بە حیکمەتو زادەو بەرهەمی جەنگو بەرەنگاربوونەوە دادەنێ !

لەوبارەشەوە کە ڕیزو کۆمەڵی مسوڵمانانیش بە گشتیی بەهۆی تاقیکردنەوەو گرفتارییو ناڕەحەتییو سەختییەکانی جەنگو جیهادەوە پاكو پوختەو پاڵفتە دەبێتو لە بێژنگ دەدرێت، خوای بێ هاوتا "جلّ وعلا" فەرموویەتی: ﴿ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ ۚ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ آل عمران.

وەك دەبینین خوای کاربەجێ پێنج شتی کردوونە حیکمەتو بەرهەمی جەنگو جیهاد کە ئەمانەن:

١- ﴿ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾: بۆ ئەوەی خوا ئیمانداران بناسێو بۆی دەرکەون، کە چۆنن لە مەیدانی واقیعدا، ئەگەرنا خوا زانیاری هەر بوو و بێ سنووری هەیە.

٢- ﴿ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ﴾: وە بۆ ئەوەی چەند شەهیدێکتان لە

نێودا هەڵبژێری.

٣- ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾: وە خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت بۆیە حەز دەکات بێ دەسەڵات بن.

٤- ﴿ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾: وە بۆ ئەوەی خوا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە پاڵفتە بکات.

٥- ﴿ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾: وە بۆ ئەوەی کافران کزو بێ دەسەڵات بکات.

وەك دەبینین یەکێك لە حیکمەتو بەرهەمە گەورەو گرنگەکانی تاقیکردنەوەی خوا بۆ ئەهلی ئیمان، بەهۆی جەنگو جیهادەوە، ئەوەیە کە مەیدانی جیهادیان بۆ بکاتە بێژینگێكو پاكو پیسیان لەیەك جیا بکاتەوە، تاکو ڕیزەکانیان تۆکمەو توندوتۆڵو پێکەوە جۆشدراو بن.

بەڵێ، بەڕاستی لە گەرمەی جیهادو جەنگو گرفتاریی‌و ناڕەحەتییەکاندا ئینسانی مسوڵمان‌و کۆمەڵی مسوڵمان لە خۆیان حاڵی دەبن‌و، وەك پێویست خۆیان دەناسن‌و، دەزانن تا چ ڕاددەیەك خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکانی وەك:

خوا پێ مەبەست بوون‌و، پارێزکاریی‌و، پشت بەخوا بەستن‌و، فیداکاریی‌و، ئازایەتی‌و، ماڵ بەخشین‌و...هتدن یان تێدایەو، لە سیفەتە نزم‌و پەستەکانی وەك: ڕیابازیی‌و، دنیاویستیی‌و، ترسنۆکیی‌و، ڕژدیی‌و..هتد، دوورن!

هەروەها لە ئەنجامی گرفتاریی‌و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەختیی‌و دژوارییەکاندا، کۆمەڵ‌و میللەتی مسوڵمانان خۆیان دەناسن، کە تا چ

ڕاددەیەك: برایەتیی‌و تەبایی‌و هاوكاریی‌و دەستبار بۆ یەكتــرگرتن‌و گوێگرتن‌و فەرمانبەریی بۆ سەرووی خۆو، قازاج‌و زیانی یەكتر پێ وەك هی خۆبون‌و... هتد یان هەیەو، تا چ ڕاددەیەكیش بە خەسڵەتە پەستەكانی پێچەوانەی ئەمانەوە گرفتارو گیــرۆدە بوونە !

## شەشــەم: سوننەتی خــوا ﷻ وایــە كــە هــەتا مــسوڵمانان قۆناغی تاقیكردنەوە نەبڕن‌و ساغ نەبنەوە، نەیانباتە قۆناغی باڵادەستیی‌و حوكمڕانییــەوە:

ئــەم ڕاستییەش وێــڕای چــەندان ئایــەتی بــەهێزو پێــزی خــوا ﷻ سیــڕەو ژیــانی ســەرجەم خــوا صوڵــحاوانیش بــە درێــژایی مێــژوو دەلالــەتی لەســەر دەكــات، بــە تایبــەتی سیـــڕەو ژیــانی پێغەمبــەری كۆتایی (محمد بن عبدالله) ﷺ‌و هاوەڵە بەڕێزەكانی كە دوای ئــەوەی لە قۆناغی مەككەدا (المرحلة المكية)دا بەدەمیان جۆر تاقیكردنەوەی سەخت‌و دژواردا تێپەڕین‌و، هیچ شتێك نەما كە لەسەر خوا تووشیان نەیەت‌و، ئەوانیش وەك كێوی نەلەخشــاو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ دامــەزراوترو پێ چەســپاوترو خۆڕاگرتر دەبوون.

بەڵێ دوای ئــەوە، خــوای بــەرزو مــەزن دەرووی خێــری لێكردنــەوەو كۆچكردن (هجرة)ی بەرەو شاری (یثرب)ی بۆ ڕەخســاندن‌و چوونە قۆناغێكی دیكــەوە، وەك خــوای بەخشــەر لەوبارەوە فەرموویــەتی:

﴿ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٢٦ ﴾ الأنفال.

هەروەها ئەم سوننەتو یاسایەی خوای باڵادەست، تاك تاكی موسوڵمانانیش هەر دەگرێتەوە، ئەوەتا خوای كاربەجێ پاش ئەوەی (ابراهیم)ی "علیە الصلاة والسلام" بە هەموو قۆناغەكانی تاقیكردنەوە (إبتلاء)دا تێپەڕاندوەو، لە هەموویاندا سەر بەرزانە دەرچووەو، هەموو فەرمانەكانی خوای پەروەردگاری زۆرباش جێبەجێكردوون، ئەوجار بۆتە شایستەی ئەوە، كە خوا بیكاتە پێشەوا (امام) بۆ خەڵكی: ﴿ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: وەیادی ئەوكاتە بكەوە، كە پەروەردگاری ئیبراهیم بە چەند وشەیەك (فەرمانێك) تاقیكردەوەو ئەویش دەستو برد بەتەواویی جێبەجێیكردن، خواش پێی فەرموو: من دەتكێرم بە پێشەوا بۆ خەڵكی، (ئیبراهیم) گوتی: ئەدی لە وەچەكەم (كەس ناكەیە پێشەوا)؟! (خوا) فەرمووی: ستەمكاران شایستەی وەرگرتنی (خەڵاتی) بەڵێنی من (كە بیانگێرم بە پێشەوا) نین.

جا ئەو سوننەتەی خوای كاربەجێ، وەك هەر یاساو سوننەتێكی دیكەی، چەندان حیكمەتی بەرزو گەورەی تێدان، كە یەكیان ئەوەیە: ئەگەر بێتو مسوڵمانان پێش گوزەراندنی قۆناغی تاقیكردنەوەو ساغبوونەوەو پاكبوونەوەو قاڵبوونەوە بچنە نێو قۆناغی دەسەڵات (مرحلة التمكین)و حوكمڕانییەوە، ئەوە بێگومان لە سۆنگەی كەموكوڕیی‌و كرچو كاڵییەكانیانەوە، دەبنە نموونەیەكی ناتەواوو سادەو سەركێڵو ناشیرینكەر، بۆ سیمای گەشو جوانو ڕاستەقینەی ئیسلامو شەریعەتو سیستەمە بێ وێنەكەی !

بەڵێ، پێویستە مسوڵمانان بەرلەوەی ئەرکی قورسی حوکم‌و سیستەمی ئیسلامییان بکەوێتە سەرشان، پێشتر چاك چاك تەزکییەو پەروەردە بووبن‌و، لەگەڵ ئیسلامدا تەفاعولیان کردبێ‌و، چووبنە ئاستی بەرزی ئیسلامەوە، ئەگەرنا بە تەئکید، ئەگەر بەبێ پەروەردە بوون‌و خۆئامادەکردن، کت‌وپڕ بەسەر هەڵگرتنی ئەرکی قورسی بەڕێوەبردنی حوکم‌و سیستەمی ئیسلامیی‌و، پیادەکردنی شەریعەتدا بکەون، مەحاڵە، کە لەجێبەجێکردنی ئەو ئەرکەیاندا سەرکەوتووبن، وەك چۆن بابای وەرزشکار ناتوانێ هەر لە سەرەتاوەو یەك تەکان ئەو کێشە قورس (الوزنة الثقيلة)یە بەرزبکاتەوە، کە بابایەکی دیکەی مەشق دیتوو و ڕاهاتوو، دەیتوانێ !

بۆیە لێرەوە ئامۆژگاریی هەموو دڵسۆزانی مەیدانی کارو چالاکی ئیسلامیی دەکەم‌و بەرلەوانیش هی خۆم کە، با:

لە قۆناغی بانگەوازو پەروەردەو تەزکییەو خۆگۆڕین‌و...هتددا بەپەلەو پشوو کورت‌و عاتیفیی خۆڕاگرنەبین‌و، هەر لەبیری حوکمڕانییکردندا نەبین، بێ ئەوەی کاری جیددییمان کردبێت، بۆ سازو ئامادەکردنی پێشەکیی‌و زەمینە خۆشکەرەکانی، چونکە وەك چۆن خوای کاربەجێ سەرزەنشتی کەسانێکی کردوە، کە لە جەنگ‌و جیهاد خۆیان بەجێ هێشتوە، بەوەی کە ئەگەر ویستبایان لە کاتی خۆیدا بچن بۆ جیهاد، پێشتر خۆیانیان بۆ سازو ئامادە دەکردو، پێداویستییەکانیان بۆ دابین دەکرد، وەك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً ... ﴿٤٦﴾ ﴾ التوبة.

بە هەمان شێوەش کەسانێك بەڕاستیی بەتەمای ئەوە بن کە لە کۆمەڵگاکەیاندا شەریعەتی خوا بەرپا بێت، پێویستە لە: بۆ سازکردنی زەمینەو دابینکردنی پێداویستییەکانیەوە دەستبەکاربن، نەك تەنها وەك درووشمو شیعارێك باسی ئەو مەسەلەیە بکەنو جێبەجێکردنی شەریعەت (تطبیق الشریعة) بکەنە ویردی سەر زمانیان !

وە بەڕاستیی من پڕ بەدڵ بەزەییم بەو کەسانەدا دێتەوە، کە لە بواری تێگەیشتنی ئیسلامو تەزکیەو پەروەردە بوونو ڕەوشتو ئادابی ئیسلامییدا، زۆر کەمدەستو بەجێماونو شتێکی وایان پێ نیەو، هەر هیچ سەریان لە پرۆژەی سیاسییو ئابووریو کۆمەڵایەتیو...هتدی ئیسلام بۆ پاکسازییو چاکسازیی کۆمەڵگاو بنیاتنانی کیانو قەوارەیەکی ئیسلامیی دەرناچێ، چ جای بەکردەوە خۆیانی بۆ ئامادە بکەنو پێشەکیەکانی بۆ ساز بکەن، بگرە تەنانەت هەتا ئێستا هێندە لە عەقیدەی ئیسلامییو شەریعەتی خوا بەهرەمەند نەبوونە، کە تەنانەت لەزاتی خۆشیاندا ڕەوشتو ئادابی ئیسلامیی ڕەچاو بکەن! وەهی وایان هەیە، کە هەڵسوکەوتو ڕەفتاری، نەك لەگەڵ نامسوڵمانانندا، بگرە لەگەڵ مسوڵمانانیشدا هێندە هەڵەو ناشەرعییو ڕەقو بێ سەلیقانەیە، کە خەڵکیی، خوا خوایانە لێی دووربنو، چارەی خۆی هێندە قورسو ڕەزای خۆی هێندە گران کردوە، کە هەندێك خەڵکی سادەو لە ئیسلام ناحاڵی بەوییەوە ئیسلامیشیان لەبەرچاو بێزراوە!

وە لە حاڵێکدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕەوشتو ئەدەبی بەرزو شیرینی چەندان کەسی کافری مسوڵمان کردوون، ئەو جۆرە کەسانە هی وایان هەیە کە ڕەنگە مسوڵمانیشی کافرکردبنو، بە ڕەفتاری دزێوو ناشەرعییانەی خەڵکیشی لە دین سڵەماندبێتەوەو دوور خستبێتەوە!!

دیـاره پێغەمبـەری خـواش ﷺ بـە بـێ حیكمـەت و بـێ هـودە نەیفەرمووە: ((بَشِّروا ولاتنفِّروا ويَسِّروا ولاتعَسِّروا)) متفق عليه، واتـە: دڵخۆشكەربن و موژدەبەخـش بن‌و سـڵەمێنەرەوە مـەبن، وە دین (بۆ خەڵكی) ئاسان بكەن‌و لێیـان وەزەحمەت مەخەن.

بـە كـورتیی: هەركـەس‌و كۆمـەڵ‌و لایـەنێك، بیانـەوێ میللـەت‌و كۆمەڵگایەكەیان بەرنـە قۆنـاغی باڵادەستیی (مرحلة التمكين)یەوە، پێویسـتە لـەو خاڵەوە دەست پێبكەن كـە بریتیـە لـە تـەفاعولكردن لەگـەڵ ئیسـلامدا بـە عەقیـدەو عیبـادەت‌و ئـەخلاق‌و ئادابـەوە، جا هەركاتێك توانیان ئەو قۆناغەی تاقیكرانەوە (إبتلاء)یە سەربەرزانە ببـڕن‌و، شەریعەتی خوا بەسەر خۆیاندا جێبەجێی بكەن، لـە هـەموو بوارەكانی بیـركردنەوەو هەڵسوكەوت‌و ڕەفتـاری تاكـیی‌و خێزانیـی‌و كۆمەڵایەتییاندا، ئەوە بێگومان بـڕین‌و تـەواوكردنی ئـەو قۆناغـە لـە جێبـەجێكردنی بەرنامـەی خـوا (تطبيـق شـريعة الله)، زەمینـەی چەسـپاندن‌و جێبـەجێكردنی بەرنامـەی خـوا، لـە سـەرجەم بـوارو لایەنەكانی دیكەی ژیان‌و گوزەرانیشـدا دەڕەخسـێنێ، وەك چۆن بـە شـێوەیەكی ڕێك‌و ڕاست خزمەتكردنی ڕەزو باغێـك، دەبێتـە مایـەی هاتنەبەری‌و میوە دەركردنی لە كات‌و هەل‌ومەرجی خۆیدا، ئەگەرنا بەرزكردنەوەی دروشم‌و شیعاری گەورەی: (با شـەریعەت جێبـەجێ بكەین !) بەبێ كـاركردنی جیددیی‌و هەنگـاونانی كردەیی پلـە پلـەو قۆناغ بە قۆناغ، هیچی لـێ سەوز نابێت‌و سـەری بـە هـیچ ئـەنجامێك ناگـات، پێشـینانیش جوانیان گوتـوە: (بە حەڵوا حـەڵوا دەم شیـرین نابێ !)، هەروەها قسـەیەكی بەجێیـان كـردووە، كـە گوتوویانـە: (نـە هەموو خوڕڕەیەك ئاوەو نە هەموو چنراوێك جاوە).

## حەوتەم: تاقیکردنەوەی موسوڵمانان لە سایەی شوومی جیهانگیریی (العولمة) دا یەکجار قورس و سەختەو پێویستە خۆیانی بۆ ساز بکەن:

بەڵێ خوێنەرە بەڕێزەکان!

لە سایەی شوومی ئەو سیستەمو واقیعە پیس و گەندەڵەدا کە ناوی لێنراوە بەجیهانییکردن (العولمة) و لە ڕاستیشدا بریتیە لە بە ئەمریکاییکردنی (الأمركة) و زاڵکردن و بە زۆر سەپاندنی فەرهەنگ و بەها ماددیی و ئاژەڵیی و نزم و پەستەکانی ئەمریکاو ڕۆژئاوا، بەسەر هەموو گەلانی دنیادا، بەڵێ لەو سایە شوومەداو، لەو واقیع و هەل و مەرجە پیس و پۆخەڵ و دواکەوتووو گەندەڵەدا، تاقیکردنەوەی موسوڵمانان زۆر سەخت و قورس و دژوارە، چونکە، لە لایەکەوە وەك پێشتر خستمانە ڕوو، ئیسلام بە هیچ ڕەنگێك ڕێ بە موسوڵمانان نادات کە تەسلیمی واقیع و هەل و مەرجی ناشەرعیی ببن و خۆیان بەدەستەوە بدەن، هەرچەندە گەورەترین فشاریشیان بێتە سەرو تەنانەت بشفەوتێن!

لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەچۆك داهاتن و تەسلیمبوونی موسوڵمانان، لە بەرامبەر نەفامێتی (الجاهلية) و حوکم و دەستەڵاتی تاغووت و دیکتاتۆرەکاندا، ڕاست پێچەوانەو دژی خوا بە یەکگرتن (التوحید)ە کە کاکڵ و جەوهەری دینداریی و موسوڵمانەتییە، ﴿ ...إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ... ﴿٤٠﴾ ﴾ یوسف،

واتە: حوکم تەنها هی خوایە، فەرمانی کردوە کە بەس ئەو بپەرستن، ئا ئەوەیە ئایینی ڕاست.

لە لایەکی دیکەشەوە جیهانگیریی (العولمة)ش وەك زۆر بە ڕاشکاویی لەسەر زاری (جۆرج W بۆش)ی سەرۆك کۆماری ئێستای ئەمریکا ڕایگەیاندوە[1]، بانگەشە دەکاتو هەوڵ دەدات، کە بێڕەزاترینو درندانەترین جۆرە دیکتاتۆریی و فیرعەونایەتی بەسەر دنیادا بەگشتییو ئۆممەتی ئیسلامدا بەتایبەتی بسەپێنێو، بە ئاشکراش دەڵێ: (هەرکەسێكو لایەنێكو دەوڵەتێك لەگەڵم نەبێتو وەك من بیرنەکاتەوە، ئەوە دوژمنمەو حاڵەتی سێیەم (بێ لایەنیی)ش لە هیچ کەس قبووڵ ناکەم !).

بێگومان ئەم قسەیەی (بۆش) نەك هەر هیچی لەو قسەیەی (فیرعەون: خۆفۆ)ی چوار پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر کە گوتوویەتی:

﴿... مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾

غافر، کەم نیە، بەڵکو قسەکەی (جۆرج بۆش)یش فیرعەونانەیەو، بگرە دەبێ بڵێین: ئەو قسەیەی (فیرعەون) جۆرج بۆشانەیە!

جا هەروەك چۆن (موسی) "علیه الصلاة والسلام"و ئەو مسوڵمانانەی، کە شوێنی کەوتبوون، نەیانتوانی لەگەڵ فیرعەوندا مەدار بکەنو سەرەنجامیان تێکگیران بوو!

بە تەئکید ئێمەی مسوڵمانیش لە کوردستانو غەیری کوردستانیشدا، مادام مەحاڵە دەستبەرداریی دینو عەقیدەمان بینو لە بەرانبەر تاغووتاندا تەسلیم بین، وە واش پێناچێ جیهانگیریی

---

١) لە ساڵی (٢٠٠١)ی زایینی دا.

(العولـمة)یـش بـە قیـادەی ئەمریکـا دەسـتبەرداری ئـەو سیـستەمەو نەخشەو پیلانە گڵاوو گەندەڵانـەی خـۆی ببـێ، بۆیـە: مـن وام دێتـە بەرچاو کـە تێکگیـرانی ئـەهلی ئیـسلام یـان ڕاسـتتـر بڵێین: گـەڕ پێگـێڕانو شـەڕ پـێ فرۆشـتنی ئـەو سیـستەمە نـەفامیی (النظـام الجاهلي)یـە بـە مـسوڵمانان، وەیەخـە پێگرتنو گێچـەڵ پێکردنیـان شتێکی حەتمییو مسۆگەرە[1]، بۆیە پێویـستە هەموو لایـەکمان زۆر چاك خۆمان بۆ ئەو شەڕو گێچەڵەی ئەو تاغووتـە زلـە بـەڵام بۆشـە، ئامـادەو سـاز بکـەینو، دڵـنیاش بـین کـە سـەرنجامی چـاك تـەنهاو تەنها لە گرەوی ئەهلی ئیـسلام دایە لە دنیاو لـە دواڕۆژیـشـدا، بـەڵام بە مەرجی پارێزکاریی: ﴿ ..فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ هود.

ئیـدی خـوا بـە کـەرەمو بەخـشش‌و بـەزەیی‌و لـوتفی بـێ سـنووری خـۆی لـەو مـسوڵمانانەمان بگێـڕێ، کـە بـەهۆی ئیمـانو تـەقواوە، پلەوپایـەی بـەرزی دۆسـتایەتی خـوا (ولایـة الله) وە دەسـت دێـننو، دۆسـتانی خواش هەمیشـە خۆڕاگرو سەربەزو نەلەخشـاون: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾ یونس.

---

١) تێبینی: ئەم نووسینە نزیکەی پێنج مانگ بەر لە موشەکبارانەکەی ئەمریکا، بۆ بنکەو بارەگاکانمان لە (ئەحمەد ئاوا)و دەوروبەری بووە!!

خوێنەرە بەڕێزەكان!

خـوا پـشـتیوان بێ لـەم بەشی دووەمـەدا سێ ئاگاداریی و تێبینـی پێویستتان ئاڕاستە دەكەم، بۆ ئەوەی لـە تێگەیشتنی چـەمك و واتـای تاقیكردنـەوە (إبـتلاء)دا، دووچـاری بـە هەڵەداچـوون نـەبن، چـونكە مـەرج نییـە هـەركات ئینـسان گیـرۆدەی گرفت و بەڵایـەك بـوو بـەو چەمك و پێناسەیەی، كە ئێمە باسی دەكەین، لەم نامیلكەیـەدا ـ بۆی بـە تاقیكردنــەوە (إبـتلاء) حیـساب بكرێـت و، بـۆی ببێتـە مایـەی (كفارة)ی گوناحەكانی و بەرزكردنەوەی پلەكانی.

## ئاگاداریی یەكەم: هەركەسێك لەسەر ڕێبازو بەرنامەی غـەیری خوا بێت، لەسەر بەڵا و گرفتارییەكانی پاداشتی نابێ.

بـەڵێ پێویـستە هـەمووومان ئاگـاداربین، كـە تـەنها كاتێـك ئینـسان لەسەر ئەو گرفتاریی و بەڵاو ناڕەحەتی یانەی دێنەڕێی، پاداشتی لای خوا دەبێت و، بۆی دەبنە مایـەی پاكبوونـەوەو لـەخوا نیزیكبوونـەوە، كە ملكەچ و پابەندی بەرنامـەو ڕێبـازی خـوا بێـت و، لـە ژێـر عەلـەم و بەیداغی ئیسلامدا بژیەت، چونكە مەسەلە هەر ئەوە نیە، كە مرۆڤـ خۆی مانـدوو بكات و تووشـی تاقیكردنـەوەو گرفتـاریی و بـەڵا ببـێ! بـەڵكو پێویـستە مانـدووبوون و بـەڵا بەسـەرهاتنەكەش لـە ڕێبـازی خواداو لە پێناوی ڕازیكردنی خوا دابێت، ئەگەرنا ڕەنـج بـە خەسارو دەم لـە پـووش دەبێـت و پێناسـەی: ﴿ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣ ﴾ الغاشـیة، ی بەسەردا دەچەسپێ.

بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەستیش، با ئەم كورتە بەسەرهاتەی خۆمتان

لەگەڵ یەکێك لە سەرانی حیزبە نا ئیسلامییەکاندا بۆ بگێڕمەوە:

لە سالآنی سەرەتای راپەرینی جەماوەری سالّی (١٩٩١)دا بوو لە مەجلیسێکدا لەگەڵ یەکێك لەو برادەرانەی کە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن و برا گەورەی حیزبێکی عەلمانییشن، ئەم وتووێژەمان بوو:

+ پێم گوت: فلانەکەس ئایا تۆ خۆت بە مسوڵمان دەزانی یان نا؟!

- گوتی: بەڵێ بێگومان خۆم بە مسوڵمان دەزانم و نوێژو ڕۆژووشم هەیە.

+ گوتم: باشە، بەڵام خۆ ئەو حیزبەی تۆ برا گەورایەتی دەکەی، بەرنامەکەی غەیری ئیسلامە.

- گوتی: جا چ گرفتێك هەیە لەوەدا ئەوە بۆ کارو چالاکی سیاسیی و هێنانەدی ئامانجە نەتەوەییەکانمانە!

+ گوتم: ئاخر ناگونجێ ئینسان خۆی بە مسوڵمان بزانێ[1]، بەڵام لە بوارو لایەنێکی گرنگی ژیان و گوزەرانیشیدا شوێن غەیری ئیسلام بکەوێ و غەیری ئیسلام بەسەر ئیسلامدا هەڵبژێرێ!

- گوتی: من ئەوە نازانم، ئەوەندە هەیە من لە ڕێی میللەتەکەمدا ڕەنجی زۆرم کێشاوەو، خەباتی زۆرمکردووەو خۆیشم هەر بە

---

١) هەڵبەتە ئەوە زیاتر بابای بەرپرس (مسئول)ە، کە دەتوانێ دەستکاریی بەرنامەی حیزبەکەی بکات، یان بەرپرسیارێتی یەکە نەکات، دیارە هەر کەسێکیش خۆی بە مسوڵمان دانا، مەگەر یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام (نواقض الأسلام)ی تێدابن ئەگەرنا پێویستە هەر بە مسوڵمان مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، بەپێی بنچینەی: (نحن نحکم بالظاهر والله یتولی السرائر) ئێمە حوکم بە ڕواڵەت دەکەین و نهێنییەکان حەواڵەی خوا دەکەین.

مسـولْمان دادەنێم !

+ گوتم: ڕاستە خۆت ماندوو کردووەو ڕەنجتداوە، بەڵام چاوەڕوانی پاداشـتی لای خـوا دەکـەی لـە بەرانبـەر ئـەو خـەباتو قوربانییدانەتدا کە هەر لە سەرەتاوە ناوی خوات لێنەهێناوەو، لەسەر بناغەی شەریعەت بنیاتت نەناوە؟!

- گوتی بەڵێ، مەگەر لە ئایەتدا نیە، کە خوا پاداشتی هیچ کەس بزر ناکات؟!

+ گوتم: با ئەوە لە ئایەت دایە، بەڵام ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ۝٣٠﴾ الكهف، کەواتە: کاتێك خوا پاداشتت دەداتەوە کە کردەوەکەت باش بێت !

- گوتی: جا ئایا بەرگریی لێکردنی وڵاتو میللەت کردەوەیەکی باش نیە؟!

+ گوتم: با، بەڵام ئەگەر بتەوێ پاداشتی لای خوات هەبێتو بۆ دنیایەش کارەکەت بەرهەمداربێت، دەبێ ئەو کردەوە باشەت دوو مەرجی سەرەکی تێدابن !

- گوتی: چیو چی؟

+ گوتم: یەکەم: بە پێی بەرنامەی خوا بێتو لە چوارچێوەی شەریعەتدا ئەنجامت دابێت، دووەم: تەنها مەبەستت پێی ڕازییکردنی خوا بێت.

(پاشان ئەم وێنەیەم بۆ هێنایەوە):

ئایا ئەگەر کابرایەك چەند کرێکارێك بەکرێ بگرێو، بناغەی بینایەکیان بۆ ڕەنگ برێژێو بڵێ: ئێرەم بۆ هەڵبکەنو بیکەنە

خەنــدەك، کەچــی ئــەوان لــە جیــاتی ئــەو شــوێنەی کــە بۆیــان دیـاریکراوە، بـچن خەنــدەكو چاڵـێکی قـووڵو زل لـە شــوێنێکی دیکە لـێ بدەن! ئایا هەقیانــە ئێواره داوای کرێکـەیان بکـەن؟! وە ئایا کابرای خاوەن ئیش پێیـان ناڵـێت: کاکە ئێوه هـیچ هەقــتان ناکەوێ، چونکە ئەو کـارەی مـن پـێم گوتـوون ئـەنجامتان نـەداوە، بێهووده خۆتانتان ماندوو کردوەو ڕەنجتان بە فیـڕۆ چووە؟! وە ئایا ئەگەر وایان پێ بڵێ قسەیەکی هەقی نەکردوە؟!

- گوتی: بـا.

+ گـوتم: دەباشـە تـۆش هـیچ کـەس ناڵـێ دیفـاع لـە خـەڵكو خـاك نەکردنەکەت شتێکی خراپە، بگـره فـەرزو پێویستیشــە، چونکە خــوای کاربــەجێو دادگــەر فەرموویــەتی: ﴿...لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ٢٧٩﴾ البقرة، واتـە: نـە سـتەم لـە خـەڵك بکـەنو نـە قبووڵـیش بکـەن هـیچ کەسـێك سـتەمتان لـێ بکـات، بـەڵام ئایـا ئەگەر خوای پەنهانبین لە ڕۆژی قیامـەتێ پێـی فـەرمووی: ئـەرێ (فلانەکــەس) ئــەوه بۆچــی شــوێن بیــردۆزەو ڕێــچکەی (....) کــەوتبووی، مەگــەر مــن قورئــانم بــۆ تــۆ نــاردبوو کــە بیکەیــە بەرنامەو ڕێبازی ژیانو گوزەرانت، یان ڕێچکەی (....)؟!

- گـوتی: منـیش دەڵـێم: خوایــە مــن هــەر ئەوەنــدەم لــێ دەزانــیو خــەتای مەلایــەکان بــوو پێــشمان نەکــەوتنو ڕێی خــەباتیان پێشــان نەداین[1] !

---

١) دیــاره مــسوڵمانان بــە گــشتییو مامۆســتا (مــەلا)یــەکان بەتایبــەتی، کەمتەرخــەمییو کــەموکوڕییان هــەبووەو هەیــە، بــەڵام بــۆ بابایــەکی

+ گوتم: ئاخر خوای دادگەریش دەفەرموێ: جا مادام بە ڕێگای ڕاستت نەدەزانی بۆچی بە نەزانیی پێش میللەت کەوتبووی! مەگەر من لە قورئانێدا پێم نەفەرموو بووی، کە ئەگەر نازانن لە زانایان پرسیار بکەن: ﴿... فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ النحل.

ئیدی لێرەدا گفتوگۆیەکەمان تەواو بوو.

کەواتە: بەڵێ نابێ هەموو بابایەکی بەڵادار (مبتلی)و گرفتارو ڕەنجو مەینەتیی دیتوو، پێی وابێ هەر لەبەرئەوە کە ناوی (مسوڵمان)ی لەسەرە، لەسەر ناڕەحەتییو ڕەنجو دەردەسەرییەکانی پاداشتی لای خوای هەیە، بەڵکو بەبێ ڕێبازو ئاییني خوا گرتن، کابرا ئەگەر بە شمشێر هەوران دابێنێ، لەلای خوای دادگەرو بۆ قیامەتێ، کارەکەی فلسێك ناهێنێو سەپانی پووشێیە!

**ئاگاداریی دووەم: کەسێك لەسەر گوناح و تاوان گیرۆدەی دەردو گرفتارییەك ببێ، ئەوە هیچ کە پاداشتی نیە، بگرە لێپرسینەوەشی لەسەرە:**

ئەمیش ئاگادارییەکی دیکەی گرنگ‌و پێویستە بۆئەوەی بە هەڵە لە چەمك‌و واتای تاقیکردنەوە (إبتلاء) تێنەگەین.

با بزانین چۆن؟

ئایا دەگونجێ بابایەکی دزو جەردەو ڕێگر، یان داوێن پیس، یان خوێنرێژو پیاوکوژ لە ئەنجامی کارە دزێوو ناشەرعییەکەیدا، گیرۆدەی سزاو تۆڵەو باجدان ببێ، کەچی بەهیوابێ لەسەر ئازارو ناڕەحەتیی ئەو سزاو تۆڵەو جەزرەبەیە، خوا پاداشتی بداتەوەو بۆی بە چاکەو خێر لەقەڵەم بدرێ‌و، دڵی خۆی بەوە خۆش بکات کە: ئەوە تاقیکردنەوەی خوایەو، بەڵاو گرفتارییەکە بەسەری هێناوەو، خوای کاربەجێش ئەوانەی کە خۆشی دەوێن تاقیان دەکاتەوەو تووشی سەختیی‌و ئازاریان دەکات ؟!

بە تەئکید نەخێر، چونکە:

أ - سەرجەم ئەو فەرمایشتانەی باسی پاداشتی بەڵاو گرفتاریی‌و ناڕەحەتی دەکەن، لە کاتی باسکردن‌و ناوهێنانی مسوڵمانی دیندارو چاکدا، باسی ئەو پاداشت‌و پلەو پایە دەکەن.

ب - لە هیچ کام لە فەرمایشتەکاندا ئاماژە بۆ ئەوە نەکراوە، کە بابایەك بەهۆی گوناح‌و هەڵەو لادانیشەوە تووشی بەڵاو ناڕەحەتیی بووبێ، هەمان پاداشت‌و پلەی هەیە.

با سەرنج بدەین:

﴿ ...وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە موژدە بە خۆڕاگران بدە، ئەوانەی کاتێك بەڵایەکیان تووش دەبێ دەڵێن: ئێمە هی خواین‌و ئێمە بۆ لای وی دەگەڕێینەوە، ئا ئەوانە خوا مەدحیان دەکات‌و بەزەیی پێیاندا دێ، وە ئا ئەوانەن ڕێی ڕاست گرتووانن.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمویەتی: (( مایزال البلاء بالمؤمن والمؤمنة في نفسه وولده و ماله حتى يلقى الله تعالى وما عليه خطيئة) رواه الترمذي، وقال: حسن صحيح.

واتە: پیاوی بڕوادارو ئافرەتی بڕوادار بەردەوام لە خۆی‌و منداڵی‌و ماڵ‌و سامانیدا دووچاری گرفتاریی‌و بەڵا دێت، هەتا کاتێك کە بە دیداری خوای بەرز دەگات، هیچ گوناهی پێوە نەماوە.

وە فەرموویەتی: (( إن عِظَمَ الجزاء مع عظَمِ البلاء، وان الله تعالى اذا أحب قوماً ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا، ومن سخط فله السخط)) رواه الترمذي وقال حسن، واتە: بێگومان هەتا بەڵا گەورەتر بێ پاداشتی گەورەترە، وە خوای بەرز ئەگەر کەسانێکی خۆشویست، بەڵاو گرفتارییان بەسەر دێنێ، جا کەسێك ڕازی بێ، خوا لێی ڕازی دەبێ‌و کەسێکیش توڕەبێ، خوا لێی تووڕە دەبێ.

هەروەها فەرموویەتی: (( مَن يردِ اللهُ به خيراً يُصِبْ منه)) رواه البخاري عن أبي هريرة، واتە: هەرکەسێك خوا چاکەی بۆ بوێ، بەڵای دێنێتە ڕێ.

وه فەرموویەتی: ((ما يصيب المسلم من نَصَبٍ ولا وَصَبٍ، ولا همٍ ولا حَزَنٍ، ولا أذىً ولا غمٍ، حتى الشوكة يُشاكُها، الا كفّر الله بها من خطاياه))، متفق عليه، عن ابي سعيد الخدري وابي هريرة، واته: هیچ شتێك تووشی مسوڵمان نایەت لە ماندوێتیو ئازار، وه خەمو پەژاره، وه ناڕەحەتییو دڵتەنگیی، تەنانەت دڕکیش، کە پێیدا دەچێ، حەتمەن خوا بەهۆی ئەوەوه گوناحەکانی لێ دەسڕێتەوه.

وەك دەبینین لە هیچ کام لەو ئایەتو فەرمایشتانەدا، کە زۆری دیکەش لەوبارەوه هەن، بە ئاماژەش ئاماژه بۆ ئەوه نەکراوه، کە ئەو بەڵاو ناڕەحەتییانەی بەهۆی گوناحو لادانەوه تووشی ئینسان دەبن، پاداشتیان هەبێ، هەمووشیان لەبارەی کەسانی مسوڵمانو چاکەکارو خۆشویستراو لەلای خواوه دەدوێن.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیە پێویستە باسی بکەین، ئەویش ئەوەیە، کە هەرکاتێك بابای گوناهبارو خەتاکار گەڕایەوه لای خواو بە شێوەیەکی ساغو ڕاست (نصوح) تۆبەی کرد، ئەوه بەڕای بەهێزتر (راجح)ی زانایان، خوای بەخشەر خودی گوناحو هەڵەکانیشی بۆ دەگۆڕێ بە چاکەو تاعەت، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان.

وەك لە کتێبی (گەڕانەوه لای خوا جل جلالە)دا بەوردی باسمان کردووەو چەند بەڵگەیەکی بەهێزیشمان لەسەر هێناوەتەوه[1].

---

١) بڕوانە لاپەڕە: (١٦٧ تا ١٧٠) لە چاپی پێنجەم، ساڵی ٢٠١١ز.

کورتەی قسـان:

خوای بەخشندەو بە بەزەیی بەهۆی تاقیکردنەوەی بەندەکانییەوە بەو بەڵاو ئازارو مەینەتییانەی کە دێنە ڕێیان، گوناحەکیانیان لێدەوەرێنێ‌و پلەو پایەیان بەرز دەکاتەوە، بەڵام بەمەرجێك بە ئانقەست‌و بەهۆی گوناح‌و سەرپێچییەکانەوە خۆیان گیرۆدەی ئەو بەڵاو ئازارو ناڕەحەتییانە نەکردبێ، چونکە لە حاڵەتێکی وادا ئازارو ناڕەحەتیی‌و گرفتارییەکانی ئەو جۆرە کەسانە، ئەو پەڕەکەی بایی ئەوە دەکات کە ببێتە مایەی (کفارة)و پاکبوونەوەی خاوەنەکانیان لە خودی ئەو گوناح‌و تاوانانەی کە بە هۆیانەوە دووچاری بەڵاو سزاو تۆڵەو ناڕەحەتی بوونە !

## ئاگاداریی سێیەم: هەرکەسێك بەشێوەیەکی هەڵەو ناشەرعییانە خۆی بخاتە بەر بەڵاو تاقیکردنەوەیەك، نابێ بەتەمای پاداشت بێ:

خوێنەرە بەڕێزەکان!

ئاگاداری یەکەممان لەبارەی کەسانێکەوە بوو، کە لەحاڵێکدا شوێن بەرنامەو ڕێبازی غەیری خوا ﷻ کەوتوون، بە هیوان، کە بەڵاو ئازارو ناڕەحەتییەکانیان ببنە مایەی پاداشتدرانەومیان لە دوارۆژدا !

ئاگاداریی دووەمیش دەربارەی کەسانێك بوو، کە لە خودی خۆیاندا مسوڵمانن‌و بەپێی ئیسلام بەڕێوە دەچن، بەڵام لە حاڵێکدا کە لە سۆنگەی لە شەرع لادان‌و خراپەو تاوانەوە دووچاری سزاو ئازارو تۆڵە، یان نەخۆشیی‌و مەینەتباریی بوو ون، بە ئومێدن خوا

پاداشتیان بداتەوەو پلەو پایەیان بۆ بەرز بكاتەوە.

ئەم ئاگادارییەی سێیەمیش لەبارەی كەسانێكەوەیە، كە بە حیسابی خۆیان بە كارێكی چاكەو خێر هەڵدەستن، بۆ وێنە: فەرمان بە چاكەكردنو ڕێگریی لە خراپە كردن، جەنگو جیهاد، هەقبێژیی، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە كە كاتو شوێنو چۆنیەتیو هەلومەرجی ئەنجامدانی كارەكەیان، كە لە خودی خۆیدا شەرعییو ڕاستە - بەو جۆرە نیە كە شەریعەت دیاری كردوە- نەك هەر هیچ پاداشتێكیان نیە بگرە، بە ئەندازەی ناتەواویی كارەكەیانو زەرەو زیان لێكەوتنەوەی بۆ ئیسلامو مسوڵمانان، دووچاری لێپرسینەوەو سزاو جەزرەبەش دەبن.

جا ئێستا با سەرنج بدەین:

هەندێك كەس وا دەزانن لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( إنما الاعمال بالنيات وإنما لكل امريء مانوى..)) متفق عليه عن عمر بن الخطاب ﷺ، واتە: بێگومان كردەوەكان[1]، بە گوێرەی نیازو مەبەستەكانن، بە تەئكید هەركەسە بەپێی نیازو مەبەستی پاداشتی هەیە...

بەڵێ وادەزانن مادام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی كردەوەكان بە گوێرەی نیاز (نیة)ەكان پاداشتیان هەیە، هەركەسێك هەرچۆنێكی عەقڵی بڕی بە كارێكی خێرو چاكە هەڵسا، ئەوە ئەو

---

١) بێگومان مەبەست لە كردەوەكان (الاعمال) تەنها كردەوە چاكەكانن، چونكە كردەوەی خراپ بە نیەتی چاك ناگۆڕێو باش نابێ، بڕوانە: (جامع العلوم والحكم) لابن رجب الحنبلي، ص ١٦.

كارە ئەنجام‌و ئاكامی هەرچۆنێكی بێت‌و هەر شوێنەوارێكی چاك یان خراپی لێبكەوێتەوە، خاوەنی كردەوەكە بە گوێرەی نیازو مەبەستی نێو دڵی خۆی پاداشتی لای خوای هەر مسۆگەر (مضمون)ە !! چونكە مادام لەڕێی خواداو لەسەر ئیسلام تووشی بەڵاو گرفتاریی‌و ڕەنج‌و مەینەتیی‌و ئازارو سەرئێشە بووە، ئەوە بە ئەندازەی ئێش‌و ژان‌و ئازارەكەی، مادام نیازی نێودڵی تەواو بێت، پاداشتی دەدرێتەوە !!

جا بێگومان ئەو جۆرە بیركردنەوەو تێگەیشتنەش لە مەسەلەی تاقیكردنـــەوەو بـــەڵاو ناڕەحـــەتیی بەســـەرهاتن، زۆر هەڵـــەو سەركێڵانەیەو خاوەنەكەی تووشی چۆرتم‌و غەڵەت‌و پەڵەتی سەیر سەیر دەكات‌و، ڕەنگە هەڵوێستی وای پێ بنوێنێ، كە ئەم پەندە كوردییەی بەسەردا بچەسپێنێ كە دەڵێ: (بۆ دەسەسرێك قەیسەری یەك دەسووتێنێ !).

دیارە بەڵگەشمان بۆ ئیسپاتی هەڵەیی ئەو بیروبۆچوونە زۆرن، بۆ نموونە:

یـەك: خـوای پـەروەردگار فەرموویـەتی: ﴿...إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾﴾ المائدة، واتە: بە تەئكید خوا تەنها (كردەوەی باش) لە پارێزكاران قبووڵ دەكات، ئاشكراشە كە بناغەو كاكڵی پارێزكاریی (تقوى) دوو شتە:

یەكەم: بە پێی شەرعی خوا بوونی ئەو كارەی كە ئەنجام دەدرێ.

دووەم: تەنها خوا پێ مەبەست بوون تێیدا.

ئینجا شتێكی ڕوونە كە بەپێی شەرعبوونی كردەوەی باش، هەم ئەسڵی كردەوەكەو هەم چۆنیەتی‌و كات‌و شوێنی ئەنجام

دانەكەیشی دەگرێتەوە.

بۆ وێنە:

نوێژكردن، دەبێ بابایەك كە كردەوەی نوێژ ئەنجام دەدات، هەم لە ئەسڵدا جۆرە نوێژێك بكات كە شەرع دایناب‌ێ، بۆ نموونە: سوننەتی چێشتەنگاو (صلاة الضحى)، نەك بۆخۆی لە خۆەوە جۆرە نوێژێك پەیدا بكاتو دایبهێنێ، وە هەم دەبێ لە چۆنیەتیو كاتو شوێنەكەیشیدا ڕەچاوی شەرع بكاتو، لەوكاتو شوێنەداو بەو چۆنیەتی (كیفیة)یە بیكات كە شەرع دیاری كردوە.

كەواتە: مەسەلە تەنها ئەوە نیە كردەوەی چاك بكەی، بەڵكو پێویستە بەشێوەیەكی چاكیش بیكەی، وەك چۆن هەق گوتن چەندە گرنگو پێویستە، بەشێوەیەكی هەقو ڕاست گوتنیشی هێندە.

دوو: خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ... ﴿١٦﴾ ﴾ التغابن، واتە: ئەوەندەی بۆتان دەكرێ پارێز لە خوا بكەن، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( وأذا أمرتكم بأمر فأتوا منه ماستطعتم)) رواه البخاري.

ئاشكراشە كە حیكمەتی ئەوە كە خوای كاربەجێ تبارك وتعالى هەر ئەوەندەی لەسەر ئینسان پێویست كردوە كە بۆی دەگونجێو لەتوانایدا هەیە، ئەوەیە كە ئەگەر بێتو ئینسان مل بەبەر كارێكەوە بنێ كە توانای بەسەریدا ناشكێ، یان لە ژێریدا دەكەوێ، یان بە نیوەچڵیی جێبەجێ دەكات ! دیارە هەركام لەو دووانەش خراپنو شەرع ڕێیان پێ نادات.

سێ: زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەسەر ئەوە رێککەوتوون‌و یەکدەنگن، کە سەرجەم جم‌وجۆڵ‌و چالاکییە شەرعییەکان لە حاڵێکدا کە تواناو برست‌و هەلومەرجی ئەنجام درانیان وەك پێویست نەڕەخساوەو، لەکاتی دەست بۆ بردنیان‌و تێدا دەست بەکاربوونیاندا ئەگەری زەرەرو زیان‌و بە ئاکام نەگەیشتنیان زیاترە، دروست نیە دەستیان بۆ ببرێ.

بۆ وێنە: لەبارەی جەنگ‌و جیهادەوە گوتوویانە: کە جەنگ‌و جیهاد بە گوێرەی هەلومەرجە جیاوازەکان حوکمی دەگۆڕێ‌و لە حاڵەتی جیاجیادا هەر پێنج حوکمە شەرعییەکان (الأحكام الشرعية الخمسة)ی بەسەردا دەچەسپێن، واتە جاری وا هەیە جەنگ‌و جیهاد فەرزە، فەرزی کیفایە، یان عەین، جاری واش هەیە سوننەتەو هەندێ: جاریش قەدەغە (حرام)، یان ناپەسەند (مكروه) دەبێ، جاری واش هەیە ڕەوا (مباح)یە[1].

هەروەها لەبارەی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)یشەوە بەهەمان شێوە، زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەرکاتێك فەرمان بە چاکەیەك، ببێتە مایەی تێکچوونی چاکەیەکی گەورەتر (إنعدام معروف أكبر)، یان هاتنەدی خراپەیەك، کە زیانی لە سوودی چاکە فەرمانپێکراوەکە زیاتر بێت، دروست نیە! دیسان لابردنی خراپە (إزالة منكر)یەکیش، کە سەردەکێشێ بۆ پەیدابوونی خراپەیەکی دیکە، کە گەورەتر بێ لەو خراپەیەی، کە دەویسترێ لاببرێ، ئەویش دروست نیە.

---

١) بڕوانە: (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية)، ج٢، د. محمد خير هيكل.

هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە، هەرچەندە بە (عائشة)ی هاوسەری خوا لێی ڕازی بێ فەرمووە: كە بینای كەعبە لەسەر بناغەكەی ئیبراهیم (علیه السلام) دانەمەزرێنراوەتەوە، كەچی چاوپۆشیی لە ڕاستكردنەوەی (كعبه) كردوە بە بەڵگەو پاساوی ئەوە، كە خەڵكەكە لە سەردەمی (شرك)ەوە نیزیكن‌و، نەبادا تووشی گرفت‌و دڵگۆڕانێك ببن !

هەروەها لە ژیانی (شیخ الإسلام ابن تیمیة)دا هاتوە، كە جارێكیان بەلای پێرێك لە تەتەرەكاندا تێپەڕ بووە، كە سەرگەرمی مەیخواردنەوە بوونە، كەچی كاتێك، كە هاوەڵەكانی پێشنیاریان كردوە، بچن لێیان تێكبدەن‌و ڕێی ئەو (منكر)ە یان لێ بگرن، ڕێی نەداوە، بە بەڵگەو پاساوی ئەوە، كە ئەو خراپەیەی ئێستا پێیەوە خەریكن، زیانی كەمترە لە خراپەكانی دیكە، كە ئەگەر سەرخۆش نەبن بیریان لێدەكەنەوە، وەك خوێنڕێژیی‌و دزیی‌و جەردەیی.

چوار: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە، كە بابای مسوڵمان خۆی بخاتە حاڵەتێكەوە كە تێیدا زەبوون (ذلیل) ببێ، وەك لە یەكێك لە فەرمایشتەكانیدا فەرموویەتی: ((لا ینبغي لمؤمن أن یذل نفسه، قیل: كیف یذل نَفْسَهُ؟ قال: یَتعَرّض من البلاء ما لا یطیق) رواه أحمد والترمذي و صححه عن جندب، و رواه ابن ماجة عن حذیفة[1]، واتە: هیچ بڕوادارێك بۆی نیە خۆی زەبوون بكات، گوترا: چۆن خۆی زەلیل دەكات؟ فەرمووی: خۆی

---

١) بڕوانە: (كشف الخفا و مزیل الإلباس عما اشتهر من الأحادیث على السنة الناس)، ج٢، ص ٥٠٦.

دەداتە بەر بەڵاو تاقیكردنەوەی وا كە لە توانایدا نیە. (واتە دەچێتە ژێر كۆڵێك كە لە بنیدا دەكەوێ).

دیارە هەر لەو ڕوانگەیەشەوەیە كە پێغەمبەری كارزانمان ﷺ قەدەغەی كردوە كە مسوڵمانان جەنگ و بەرەنگاریی لەگەڵ دوژمنانیاندا بە ئاوات بخوازن‌و، سەریان بۆی بخورێ ! بۆچی؟ چونكە نازانن چۆن دەردەچن !

ئەوەتا فەرموویەتی: (لا تتمنوا لقاء العدو فاذا لقیتموه فاصبروا...)) رواه مسلم.

دیارە پێویستیش ناكات هیچكەس بەهەڵە لەم قسانەم تێ بگات‌و وابزانێ، كە من دەڵێم: ئەگەر دوژمنان ستەم‌و دەستدرێژیشیان كردە سەر مسوڵمانان، دەبێ هەر بێدەنگ بین‌و خۆمان لە ڕووبەڕووبوونەوە لابدەین.

نەء، من ناڵێم: ئەگەر شەڕت پێ فرۆشراو، تۆش توانای بەرگریی لەخۆكردن‌و دەستكردنەوەت هەبوو، دەستوەستان دابنیشە! بەڵكو من دەڵێم: نابێ مسوڵمانان هیچ كاتێك عەوداڵی تێككیران بن، بەتایبەتیش كاتێك، كە ئامادەیی تەواویان نەكردوە، وە دەبێ ئەوەندەی لە شەرعدا جێی دەبێتەوە خۆیان لە شەڕو جەنگێك لابدەن، كە دەزانن قازانجیان نیە بیكەن، نەك وەك تفەنگی سوارو لەسەرپێ هەردەم ئامادەی خۆپێدادان بن، بێ‌ئەوەی گوێ بدەنە قازانج‌و زیان‌و ئاكام‌و سەرەنجام، چونكە ئەو جۆرە هەڵوێست وەرگرتنە سەركێڵانەو عاتیفی یانە وێڕای ناشەرعیی بوون، تەمەن كورت‌و بێ ئاكام‌و بێ بەرهەمیشە.

بەڵام لەكاتێكدا كە شەڕ بەری دەرگات پێ دەگرێ‌و، ناچار دەكرێ لە نێوان خۆبەدەستەوەدان‌و دەستكردنەوەو بەرگریی لە خۆكردندا،

ئەوە بێگومـان دەسـتکردنەوە بەهـەر شـێوەیەك كـە دەلوێ ئەوپـەڕی جـوامێریی‌و مەردایەتییـەو، تەسـلیم بـوون‌و دەسـتنەکردنەوەش، مەگەر وەك مۆڵەت (رخصـة)و لـە حاڵـەتی زۆر ناچارییدا، ئەگـەرنا بە هیچ جۆرێك دروست نیە، شیکردنەوەو لەیەك جیاکردنەوەی ئەو حاڵەتە جۆراوجۆرانەش پێویسـتی بە توێژینـەوەی تایبـەت دەکات‌و، لێرەدا بەس مەبەستم ئاماژەکردنێکی گشـتی بوو.

هەڵبەتە پێویسـتە وریاش بین‌و لە بەڵگە هێنانەوە (الإستدلال)مان بـۆ کـارو هەڵوێـستەکانماندا، بـەهۆی لاریـی‌و خـواریی کـارو هەڵوێـستەکانمانەوە، مـل بـە ئایـەت‌و فـەرموودەو بەڵگـە شـەرعییەکانیش لار نەکـەین‌و بـەرەو لای ئـارەزوو و بەرژەوەندییەکانمان وەریان نەسووڕێنین.

بـۆ وێنـە: بەسـەرهاتی (الأصحاب الاخـدود)[١]، کـە لـە سـوورەتی (البـروج)دا هـاتوە پێغەمبـەریش ﷺ وەك لـە (صـحیح مـسلم)دا هاتوە، بەسەرهاتێکی لەبارەوە گێڕاوەتەوە کە بە: بەسەرهاتی کوڕەکە (قصة الغلام) ناسراوە، ناگونجێ بکرێتە بەڵگەو پاساوی هـەر جۆرە جـەنگ‌و جیهادکردنێـك، کـە هـەر ڕەخنـەو گلـەیی‌و تێبینییـەکی شەرعییت خسـتەڕوو، کە فلان شێوەکارکردنە هەڵەیـەو بـە کەڵك نایـەت، یەکسـەر بگوترێ: جا ئەوپـەڕی هـەر ئـەوە نیـە، کـە وەك مـسوڵمانانی بەسـەرهاتی (أصحاب الاخـدود) بکوژرێین، فەیناکـات هەرچی دەبێ با ببێ[٢]!

---

١) (أصحاب الاخدود) نازناوی کافرە زۆردارەکانە، نەك هی مسـوڵمانەکان.

٢) ئـەو جـۆرە هەڵوێـستانە لـە هەنـدێك کـۆڕو کۆمـەڵی ئیـسلامیی سـادەو کرچ‌وکاڵ بیسـتراوو بینراون.

چونکە بێگومان ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە، بێجگە لە قەڵاچۆکران یان هەڵگەڕانەوە، هیچ چارەو بەدیلێکی دیکەیان لەبەردەمدا نەبووە! جا ڕاستە هەرکەس و کۆمەڵێکی دیکەش کەوتنە حاڵەتێکی لەو جۆرەوە، کە ئەو مسوڵمانە چەوساوانە گیرۆدەی بوونە، دیارە پێویستە هەمان هەڵوێستی ئەوانیش، کە بریتییە لە: (هەڵبژاردنی دین بەسەر ژیندا)، بنوێنرێ، چونکە بەدیلی ئەو هەڵوێستە مەردانەو جوامێرانەیە، تەسلیم بوونە، کە بێگومان بە هیچ ڕەنگێك - مەگەر لە حاڵەتی دەگمەن و ڕیزپەڕدا شایستەی ئینسانی مسوڵمان نیە-.

بەڵام ئایا بۆ کەسانێك و لە حاڵەتێکدا کە مسوڵمانان جگە لە حاڵەتی تەسلیم بوون، بەدیلی دیکەیان هەیەو، لە شەرعیشدا جێی دەبێتەوەو، بگرە بە چەندان بەڵگەی بەهێز فەرز یان لانیکەم پەسەندیشە! وە لەحاڵێکدا کە سوپاس بۆ خوا خوشك و برای مسوڵمان زۆرن و میللەت و کۆمەڵگاش بەگشتیی مسوڵمانەو ئەهلی دینە !

بەڵێ ئایا لەو حاڵەتانەدا، بە چ شەرعێك دروستە بابایەکی مسوڵمان، یان چەند مسوڵمانێك واز لەو هەموو بەڵگانەی قورئان و سوننەت و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێنن و بەشێوەیەکی هەڵە بەسەرهاتی (أصحاب الأخدود) بە بەڵگە بهێننەوەو ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە بێچارەو گرفتارە خوا لێیان ڕازی بێ، بکەنە سەر مەشقی خۆیان!

وە ئایا ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە، جگە لە پاساوو بیانوو بۆ هەڵوێستی هەڵەی خۆ هێنانەوەو، مل بە ئایەت و فەرمایشت سووڕاندن بەرەو واقیعی لارو نالەبارو ناهەمواری خۆ، چ پێناسەیەکی دیکە هەڵدەگرێ؟!!

## سەرەتای وتارەکە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين، أشهد ان لا الـه الا الله وحـده لا شـريك، وأشـهد أن محمـدا عبـده ورسـوله، فصَلّ اللهم وسلّم وبارك عليـه وعلى آلـه وصحبه أجمعين، ومن اهتدى بهديهم وسـار بسـيرتهم بإحسـان الـى يوم الدين، أما بعد: أوصيكم أيهـا المسـلمون وقبلكـم نفسـي بتقـوى الله قال جل شـأنه فـي محكم كتـابه: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب.

## پێشەکی

مسـولْمانە بەرێزو خۆشـەویسـتەکان، برایان خوشـکان!

ئەگەر سەرنجێك بدەینە وەزعی مسولْمانان لە سەرتاسەری عالەمی ئیـسلامییداو، هـەر لـە ڕۆژهەڵاتییـەوە تـا ڕۆژئـاوای، بـە تەئكیـد دەبیـنین کـە مـسولْمانان لـە بارودۆخو هەلومـەرجێکی زۆر سـەختو دژوارو زۆر پـشـوو سـوارکەر دان، بـەڵێ بەڕاسـتیی قۆنـاغێکی وەك ئـەوەی ئێـستا مـسولْمانانی تێدان، لـەم چاخو سـەردەمەی ئێمـەدا، قۆناغی وا سەختو نارەحەت ڕەنگە بەسـەر مـسولْماناندا نـەهاتبێو قۆناغی وایان نەبڕیبێ، جا مـن خـوا یاربـێ لەبـەر تیـشـکی قورئـانو لەبـەر تیـشکی وەزعـی ئـەمڕۆی مـسولْماناندا، باسـی تاقیکردنـەوە (ابتلاء)تان بۆ دەکەم.

سەرەتا پێویستە زۆر باش دڵنیاو مسۆگەر بینو بزانین، كە تاقیكردنەوەی ئینسان لەسەر زەوی، شتێكە خوای بەدیهێنەر بڕیاری لەسەر داوەو كردوویەتی بە ئامانجی ژیانی ئینسان، وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ ...﴿٢﴾ ﴾ الملك، واتە: خوا مردنو ژیانی ڕەخساندوە تاكو تاقیتان بكاتەوە، واتە لە ئەسڵدا ئینسان لەم سەرزەوییە داندراوە بۆ تاقیكردنەوەو جەڕبێنران، جا ئینسان بەگشتیی لەژێر تاقیكردنەوەی خوادایەو مسوڵمانانیش بەتایبەتی.

وە من خوا پشتیوان بێ لەم وتارەمدا بە كورتیو گوشراویی لە شەش (٦) بڕگەدا بۆتان باسی تاقیكردنەوەی خوا بۆ مسوڵمانان دەكەم.

لە بڕگەی یەكەمدا پێناسەی تاقیكردنەوە دەكەینو، هەركام لە وشەكانی (إبتلاء)و (إمتحان)و (إفتتان)، كە لە قورئاندا بۆ تاقیكردنەوەی مسوڵمانان بەكارهاتوون، چەمكو واتایان دەخەینەڕوو، پاشان لە بڕگەی دووەمدا، باس لە بوارەكانی تاقیكردنەوە دەكەینو باسی ئەوە دەكەین لە چ بوارێكدا مسوڵمانان تاقیدەكرێتەوە؟ یاخود ئەو ماددانەی، كە مسوڵمانان پێیان تاقیدەكرێنەوە چیو چین؟ وە لە بڕگەی سێیەمیشدا باسی مسۆگەربوونی تاقیكردنەوەی مسوڵمانان دەكەین، كە تاقیكردنەوەی خوا بۆ مسوڵمانان سوننەتێكی گشتگیرو هەمیشەییو، بڕیارێكی حەتمیی خوای پەروەردگارەو، هیچ كەسێك لێی نابوێردرێ لە مسوڵمانان، پاشان لە بڕگەی چوارەمدا باسی حیكمەتی خوای كاربەجێو پەنهان بین بۆ تاقیكردنەوەی مسوڵمانان دەكەین، ئینجا

لە برگەی پێنجەم‌و شەشەمدا باسی ئەوە دەکەین، کە ئینسان لەبەرچی‌و چی لە ئیمتحاندا دەکەوێ، وە بەچی‌و چیش دەردەچێ ؟!

خوشك‌و برا مسوڵمانەکان !

هەرکاتێك کە مسوڵمانان تووشی سەختیی‌و گرفتاریی‌و هەورازێك دێن، وەك ئێستای ئێمەی مسوڵمانانی کوردستان‌و ئێمەی ئیسلامیی لە کوردستاندا، کە بێگومان وەك بابایەکی ڕێبواری ماندووی بە بەر هەورازەوەین، وە بەڕاستی لە ژێر تاقیکردنەوەیەکی سەختداین، هەروەها مسوڵمانانی دونیا هەموویان هەروان، مسوڵمانان لە شیشان، لە کۆسۆڤۆ، لە بۆسنەو هەرسك[1]، لە کشمیر، لە فلیپین، لە وڵاتانی عەرەبیی، بە تایبەتی فەلەستین، بەڵێ، مسوڵمانان بەگشتیی لە ژێر تەجرەبەیەکی سەختدان، لە ئاوا حاڵێکدا جێی خۆیەتی لەبەر تیشکی قورئانداو، لە ژێر تیشکی فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ، لە وەزعی خۆمان ڕامێنین، وە بزانین ئەو تاقیکرانەوەو جەرپێنرانە، کە ئێمەی کەوتووینەتە نێو، تێیدا چۆنین؟ وە بەچی لەو تاقیکردنەوەیە دەردەچین؟ وە ئایا ئەم وەزعە، کە ئێستا تێیداین، ئەگەر بێت‌و لەبەر تیشکی قورئان‌و سوننەتدا تەماشای بکەین، ئایا تائێستا چۆنمان هێناوە، بەرەو دۆڕاندن‌و کەوتن دەچین، یاخود بەرەو سەرکەوتن‌و دەرچوون؟!

---

١) ئەوکاتە کێشەو گرفتی هیچ کام لە مسوڵمانە بۆسنەییەکان‌و کۆسۆڤۆییەکان چارەسەر نەکرابوو.

## ١ – مانای تاقیکردنەوەی (الإبتلاء، الإفتتان، الإمتحان):

لە قورئاندا کە فەرمایشتی بێ هەڵەوپەڵەی خوایە، خوای زاناو توانا چەند وشەیەکی بەکارهێناون بۆ تەعبیرکردن لە تاقیکردنەوەی ئینسان، کە لە کوردیدا ئێمە پێی دەڵێین: تاقیکردنەوەو جەڕباندن.

أ– یەکەمیان وشەی (إبتلاء)ە، وەك خوای بەرز دەفەرمووێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ ...﴿٢﴾ ﴾ الملك، واتە: خوا ئەو زاتەیە، کە مەرگو ژیانی ڕەخساندوون، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە.

یان وەك دەفەمووێ: ﴿ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ ﴿١٢٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیی تاقیکردەوە.

یان وەك دەفەمووێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ...﴿١٥٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: وە بێگومان بە بەشێك لە ترسو برسیەتیو لە دەستچوونی ماڵو سامانو خۆشەویستانو بەرهەمو میوەجات، تاقیتان دەکەینەوە.

یان وەك دەفەرمووێ: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ...﴿١٨٦﴾ ﴾ آل عمران، واتە: وە بێگومان لە ماڵو سامانتانو نەفسی خۆشتاندا، تاقیتان دەکەینەوە.

جا وشەی (إبتلاء) وەك شارەزایانی زمان دەڵێن، واتە: تاقیکردنەوە (الإختبار)، (راغب الأصفهانی)[1]، دەڵێ:

---

١) بڕوانە: (تفسير مفردات ألفاظ القرآن) ص ١٤٩، سميح عاطف الزين.

تاقیكردنەوەی خوای تاك بۆ عەبدەكانی دوو واتای هەن، واتایەكی بۆ خوای پەروەردگار ناشێ، كە بریتییە لەوەی كە كەسێك تاقیبكەیەوە، كە پێی ئاشنا نیو نایناسی، تاكو بزانی چۆنە؟ ئەومیان بۆ خوای زانا ناشێ، چونكە خوای پەنهان بین بۆ خۆی لە ئەزەلەوە خەڵكەكە دەناسێو بەهەموو شتێكی دیكەش زانایە، واتای دووەمیشیان ئەومیە، كە كەسێك تاقی بكەیتەوە لە حاڵێكدا كە زۆر چاك شارەزای هەیو دەیناسی، بۆ ئەوەی لایەنە چاكەكەی دەركەوێو، لەلایەن خراپەكەی جیا بێتەوە، واتە لەسەر ئەرزی واقیعدا دەرەكەوێو ئاشكرا بێ، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿... وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ...﴿١٥٤﴾﴾ آل عمران، واتە: خوا تاقیكردنەوە، بۆ ئەوەی هەرچی، كە لە سینەتاندایەو خوا پێی ئاگادارە بێتە دەرێ، ئەوەی كە لەدڵتاندایە خوا بیپاڵێوێ)، واتە: تاقیكردنەوەی خوا بۆ ئێوە بۆ ئەوە نیە كە بتانناسێ! بەڵكو خوای پەروەردگار ئاوا لە بێژنگتان دەداتو دەتان پاڵێوێ تاكو پاكو پیستان لەیەك جیا بێتەوەو (كا)و (دان)تان بكەوێتە گۆڕێ.

ب- وشەی (فتنة)ش زانایانی[1] زمان، لە بارەیەوە دەڵێن: ئەسڵی وشەی (فتنة) بریتییە لە قاڵكردنەوەی زێڕنگەر (صائغ) بۆ زێڕەكەی تاكو دەربكەوێت، ئەگەر كانزاو مەعدەنێكی دیكەی لەگەڵ تێكەڵ بووبێت لێی جیابێتەوە، هەر بۆیەش كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (زێڕی سوور یان زێڕی پاك، لە ئاگر ناترسێ)، چونكە

١) بڕوانە: (تفسیر مفردات الفاظ القرآن الكریم)، ص ٦٤٨.

زێڕی ساغو بێ خڵتە، سەد ساڵ بیسووتێنی کەم ناکات، چونکە زێڕی ئەسڵە، بەڵێ جا وشەی (فتنة) واتە: قاڵکردنەوەی زێڕ، دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر جۆرە تاقیکردنەوەیەك، نەك تەنها تاقیکردنەوەو جەڕباندنی زێڕ، بەڵکو بۆ هەر تاقیکردنەوەیەك چ پەیوەندیی بە ماهیەتی کانزا (معدن)یەکەوە هەبێ، چ جەوهەری ئینسانێك! وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ العنكبوت ﴾، واتە: ئایا خەڵك پێیانوایە هەر بەوەندە کە دەڵێن ئیمانمان هێناوە، وازیان لێدەهێنرێو تاقی ناکرێنەوە ؟!

واتە: ناخرێنە سەر ئاگری تەجرەبەو جەڕباندن، تاکو دەرکەوێ کانزایەکەیان، چەندەی زێڕەو چەندەشی خڵتەیە! ئایا دەعوای مسوڵمانانەتییەکەیان چەندەی ئیمانەو چەندەشی نیفاقە! وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ العنكبوت، بێگومان ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقیکردنەوە، تاکو خوا لە ئەنجامی ئەوەدا ئەوانەی، کە ڕاست دەکەنو درۆزنەکانیش بزانێو بناسێ.

ئەوانەی، کە ڕاست دەکەن لە ئیمانو مسوڵمانەتییاندا ئاشکرا بنو دیار بن، ئەوانی دیکەش هەر دیار بن، کە بێگومان خوا دەیانناسێ، بەڵام با لە مەحەك بدرێنو بۆ خۆشیانو بۆ خەڵکیش دەرکەون.

ج- وشەی (امتحان)یش کە پێم وایە تەنها دووجار لە قورئاندا هاتوە، جارێك بۆ پیاوان هاتوەو جارێکیش بۆ ئافرەتان، جاری یەکەمیان

لە سووڕەتی (الحجرات)دا بۆ پیاوان هاتووەو لەبارەی ئەوانەوەیە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ ... ٣﴾ الحجرات، واتە: ئەوانە(ی کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ) دەنگی خۆیان نزم دەکەنەوەو کپ دەکەن (واتە: دەنگ بەرز ناکەنەوە لە کاتێکدا کە قسەی لەگەڵدا دەکەن وەك ئەدەبو ڕێز)[1]، ئا ئەوانە خوا دڵی تاقی کردوونەوەو لە بێژینگی داوە ئەمجار تەقوای خستۆتە نێو.

جاری دووەمی هاتنی وشەی (إمتحان) بە مانای تاقیکردنەوە، ئەوەیە کە خوای بەرزو بێوێنە لە سووڕەتی(الممتحنة)دا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ ...١٠﴾ الممتحنة، واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە کاتێك کە ئافرەتانی ئیماندار کۆچیان کرد بۆ لاتان (لە مەککەوە بۆ مەدینە) ئیمتیحانیان بکەن، خوا ئیمانەکەیان دەزانێ، (بەڵام ئێوە نازانن و پێویستە تاقییان بکەنەوە).

کەواتە هەم وشەی (إبتلاء)و هەم وشەی (إمتحان)[2] و هەم وشەی (إفتتان)یش، واتە: تاقیکردنەوەو جەڕباندن و دەرخستنی ماهیەت و جەوهەری ئەو تاقیکراوەیە، کە خراوەتە ژێر جەڕباندنەوە.

---

١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکەم بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست زیاد کردوە.

٢) ئەمیش وەك (راغب الاصفهانی) گوتوویەتی هەمان مانای (إبتلاء)ی هەیە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو: ص (٨٠٤، ٨٠٥).

## ٢- بوارەکانی تێدا تاقیکرانەوە:

ئەمجارە بابزانین داخۆ ئەو بوارانەی، کە مسوڵمانیان تێدا تاقی دەکرێنەوەو ئەو ماددانە چین‌و، ئێمە بەچی‌و چی تاقی دەکرێینەوە؟! خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ...﴿١٥٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: بە تەئکید تاقیتان دەکەینەوە، بەشتێك لە ترس‌و برسیەتی‌و فەوتانی ماڵ‌و سامان‌و لەدەستدانی نەفسی خۆشەویستان‌و لە کیس چوونی بەروبوومەکان.

سەرەتا ترستان دێتە سەر، پێت دەڵێن: ئەگەر لە ڕێی کارو چالاکی ئیسلامییدا بەردەوام بی هەڵت دەواسین‌و دەرت دەکەین‌و ئاواو ئاوات پێ دەکەین، ئابلووقەت دەدەین، بژێوت نادەینێ، دەتگرین‌و دەتکوژین، ترست دەدەنێ، بەلام خۆ مەرج نیە هەڕەشەکان هەموویان بێنەدی‌و بۆیان سەربگرن!

ئنجا (وَٱلْجُوعِ) بە برسیەتی، ئابلووقەی ئابووریی (الحصار الإقتصادی) خستنە سەر، کە هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ سەری هەڵداوە، کە لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی لە شیوەکانی (ابوطالب)دا ئابلووقەیان خرابووە سەر، ئەوە عادەتێکی لەمێژینەی ئەهلی کوفرە، لە بەرانبەر ئەهلی هەقدا، ئابلووقەی بژێوی خستنە سەر، وەك چۆن کاتی خۆی کە سوپای یەزید دەوری ئیمام حوسێن (خوا لێی ڕازی بێ)و جەماعەتەکەی گرت‌و ئابلووقەیان خستنەسەرو، ڕێی ئاویان لێ بڕین‌و ویستیان بەتینوو برسی‌کردنیان چۆکیان پێ دابدەن‌و تەسلیم بن!

بەڵێ تینووكردنو برسی كردن، یەكێكە لەو ئامرازانەی كە ئەهلی كوفر بەكاری دێنن بۆ چۆك پێدادانی ئەهلی ئیمان.

ئنجا (وَنَقۡصٍ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ ) لەدەستدانی ماڵو سامان، ئەگەر بتەوێ بەڕاستیی بەندەی خوا بی، دەبێ دەستەبەرداری ماڵو سامانت بی، یان دەبێ تەنازول بكەی بۆ ئەهلی كوفرو بۆ دوژمنو تەرەفی بەرانبەر، یان دەبێ دەستبەرداری بیو ئەو كەسابەتەت بۆ ناكرێو، ناچاری لایەكیان بۆ لایەكیان واز لێ بێنی.

ئنجا (وَٱلۡأَنفُسِ ) لەدەستدانی خۆشەویستو ئازیزان.

ئنجا (وَٱلثَّمَرَٰتِ ) لەدەستدانی كشتوكاڵو بەروبووم.

كەواتە: ئێمە بە هەموو ئەوانە تاقی دەكرێینەوە، وەك خوای پاكو تاك (تبارك و تعالی) هەر لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ ...(١٨٦) ﴾ آل عمران، واتە: تاقی دەكرێتەوە لە ماڵو سامانتانو لە خۆشتاندا، هەم ماڵو سامانتان دەكەوێتە مەترسیی، هەم خۆشتان دەكەونە بەر مەترسیی.

ئنجا خوای پەروەردگار دەربارەی (ابراهیم علیه الصلاة والسلام)، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ...(١٢٤) ﴾ البقرة، واتە: كاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیكردەوە بە چەند فەرمانێكو بە چەند وشەیەك كە ئەمرو فەرمانی خوا بوون، فەرمووی: دەبێ جێبەجێیان بكەی (فَأَتَمَّهُنَّ ) ئەویش زۆر بە ڕێكو پێكیو بێ دواخستنو سستیی نواندن، هەموویانی تەواوكردنو

لـە تاقیکردنـەوەکانی خـوا دەرچـوو، فەرمانـەکانی خـوای سـەرجەم جێبـەجێکردن، خـوای پـەروەردگار پێـی فـەرموو: ئـەی ئیـبراهیم لـە عێراقـەوە {واتـە لـە ناوچـەکانی لای (بابـل)، یـان لـە کوردسـتانەوە} سـەفەرو کـۆچ بکـە بـۆ شـام، فـەرمووی: بەڵـێ، ئنجـا لـە شـامەوە بـۆ میـصر، دیـسان فـەرمووی بـەڵێ، ئنجا لـەوێوە کـۆچ بکـە بـۆ حیجاز، دیسان فەرمووی: بەڵێ، وە خوا پێی فـەرموو: ئـەو خێزانـەت لەگـەڵ تاقــە جگەرگۆشــەکەت (إســماعیل) لــە چــۆڵەوانییەکی بــێ ئــاو بەجێبهێڵە، دیسان فەرمووی: بەڵێ، پاشـان لەسـەر خـواو دینـی خـوا خـستیانە نێـو ئـاگری سـوورەوە، دیـسان هـەر فـەرمووی: لـە پێنـاوی خودادا بۆ نێو ئاگری سوریش بێ بەڵێ، هەمووی هەر بەڵێ بوو.

فەرمانەکانی خوای تێکڕا جێبەجێکردن، ئەو جار خوای کاربـەجێ پێی فەرموو: ﴿...إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا...﴾ (١٢٤) البقـرة، واتە: من دەمەوێ بتکەم بە پێشـەوای خەڵـکی.

بەڵێ مسـوڵمانینە!

کەسێك بیـەوێ ئیمامـەتیی‌و پێشەوایەتی بـۆ خـەڵك بکـات، دەبـێ سەربەرزانەو ڕووسوورانە لە تاقیکردنـەوەکانی خـوا دەربچێ‌و دەبـێ ملکەچ بێ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا، جا با بە هەر نرخێك بۆی تەواودەبن، ببن، گرنگ ئەوەیە فەرمانەکانی خوا (تبارك‌وتعالـی) جێبەجێ بکرێن، نـەك لەگـەڵ پخەیـەکیان لێکـرد، بڵێ: تۆبـە!! وەك دەڵێن: جارێـك کابرایـەك لـە غـەزای دژی ڕووس لـە جـەنگی جیهـانی یەکەمدا لە جەبهەی (سەفز) تەیارە دێت‌و، وادیارە تائەوکاتە تـەیارەی نەبینیوە، ئیدی دوای ئـەوەی هەنـدێك تـۆپی لـە دەوروبـەر دەکـەون، دەسـت بـەرەو ئاسمـان بـەرز دەکاتــەوەو دەپاڕێتــەوە دەڵـێ: خوایـە

ئەمجارە شەهیدم مەفەرموو، تۆبە جارێكی دیكە باسی غـەزا بكەم !!

مسـوڵمان نابێ وابێ، ئەدی تۆ بۆ ئەوە نەچووی كە شەهید بی، كاتێك كە شەهادەت دێتە بەر دەرگات، چۆن دەبێ تۆبەی لـێ بكەی‌و لێی پەشـێمان ببیەوە !!

جـا بۆیـە خـوای كاربـەجێ ئـەو مـاددەو بوارانـەی ناونـاوە: (إبـتلاء، إمتحان، فتنـة)، چونكە بـەو ماددانـەو پاش كەوتنـە نێـو ئـەو بـوارو مەیدانانـە، لـەوەوە خۆتـت بـۆ دەردەكـەوێ‌و لـەوەوە خەڵكیـشت بـۆ دەردەكـەوێ، واتـە هـەم خـۆت دەناسـی، داخـۆ بـایی چـەندی‌و هـەم خەڵكـیش، ئەگەرنا ڕەنگـە پێش تاقیكردنەوەت‌و خۆناسینت‌و لەخۆ حاڵی بوونت، خۆت بە پیاوێكی پڕ بەكراسی حسـاب بكەی‌و خۆت بە شێری نـەڕ حسـاب بكەی، بـەڵام كـە دەكەویـە تاقیكردنـەوە تەماشـا دەكەی ڕێوی تەواویش دەرناچی، خوا پەنامان بدات.

كەواتە: ماددەو بوارەكانی تاقیكردنـەوە لـە هـەموو شـتێك دان، لـە خۆت‌و لە دەوروبەرتدا، بۆیە پێویستە لە هەموو ڕوویێكەوە لـە خـۆت وریابی‌و هەمیشـە ئامادەبی.

## ٣- تـاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی یاسایەكی حەتمیی خوایە:

ئنجـا پێویـستە بـزانین كـە تاقیكردنـەوەی مـسوڵمانان یاسـایەك‌و سوننەتێكی خواییە ﷻ ، كـە هـیچ كـەس نـابوێرێ بـەدەقی قورئـان، خوای مەزن دەفـەرموێ:(١) ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا

١) ئـەو (هـەمزە)یـەی سـەر (احـسب) زانایـانی زمـانی عـەرەبی دەڵـێن: هـەمزەی پرسیاركردنی نكووڵیی، (الإستفهام الانكاري)یە.

وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ العنكبوت[1]، واتە: ئایا خەڵك پێیان وایە هەر بەوەندە کە دەڵێن: ئیمانمان هێنا، وازیان لێ دەهێنرێ، بێ ئەوەی تاقی بکرێنەوە داخۆ ڕاست دەکەن یان درۆ دەکەن؟ بە تەئکیدو بەڕاستیی هەرکەسێك لەوەو پێش گوتبێتی: ئیمانم هێناوە، تاقیمان کردوونەوە، بە تەئکید خوای پەروەردگار پێش تاقیکردنەوەو دوای تاقیکردنەوەش، هەر دەزانێ کێ ڕاست دەکات، کێش درۆزنە، بەڵام تاکو کەس بواری قسەو بیانووی نەمێنێ، وەك هەر لە سوڕەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ ﴿١١﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: بە تەئکید خوا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە دەیانناسێ، وە دەغەڵو دووڕووەکانیش دەناسێ، بەڵام دەیەوێ لە مەیداناو بە کردەوە حاڵی خۆیان بۆ خۆیانو بۆ خەڵك دەرکەون، بۆئەوەی بە دەعواو لاف لێدانی ڕووتیی بێ بەڵگە، خەڵك چەواشە نەبێو هەڵنەخەڵەتێ، بە (دوور کوژێکی نزیك خەسار)و بە (ڕواڵەت جوانێکی نێوەڕۆك وێران) هەڵنەخەڵەتێ، چونکە دوایی زەرەر بە دینی خوا دەگات.

## ٤ – حیکمەتو فەلسەفەی تاقیکرانەوە:

ئنجا با بزانین داخۆ فەلسەفەو حیکمەتی تاقیکرانەوە چییە؟ ئایا بۆچی خوای پەروەردگار مسوڵمانان تاقی دەکاتەوە؟ مادام

---

١) (قد) بۆ (تەحقیق)ە، (ل) لامەکەش بۆ (تأکید)ە.

دەیانناسێو زۆر چاك شارەزایانەو لە خۆیان چاکتر دەیانناسێ، بۆچی تاقییان دەکاتەوە؟

ئەگەر تەماشای ئایەتە پیرۆزەکان بکەین، وەڵامی ئەو پرسیارەمان زۆر چاك بۆ دەردەکەوێو بۆمان ڕوون دەبێتەوە، خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ﴿ ... فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: بە تەئکید خوا دەزانێو ئەوانە دەناسێ، کە ڕاست دەکەنو، ئەوانەش دەناسێ، کە درۆزنن.

بەڵام خۆ خەڵك نازانێ کێ ڕاست دەکاتو کێ درۆ دەکات، کێ بەڕاستی بڕوادارەو کێش دوو ڕووە، بەڵام دوای (إبتلاء) دەردەکەون، وەك لە سورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ... ﴿١٧٩﴾ ﴾، واتە: خوا لە ئیمانداران ناگەڕێ بەو حاڵەی، کە ئێوە لەسەرنی (بەڵکو تاقیتان دەکاتەوە) تاکو پیس لە پاك جیا دەبێتەوە.

خوای بێ وێنە بۆیە ئەوەی فەرمووە، چونکە سوپای ئیسلام پێش جەنگ تێکەڵو پێکەڵ بوون، دووڕوویان تێدا هەبوو، ئیمان لاوازیان تێدا هەبوو، ئیمان دامەزراویشیان تێدا هەبوو، بەڵام لە گەرمەی جەنگەکەدا دەردەکەوتنو هەرکەسە (محل الإعراب)ی خۆی وەرگرتو هەرکەسە دەرکەوت، کە بایی چەندە؟ بەڵێ جا ئەوەی کە خوای کاربەجێ لێرەدا فەرموویەتی: (بە تەئکید خوا لە ئیمانداران ناگەڕێ بەوشێوەیەی، کە لەسەرنی هەتاکو پاكو پیسیان لێك جیا نەبێتەوە)، ئا ئەمە یاساو سوننەتێکی هەمیشەییو نەگۆڕو چەسپاوی خوایە، کە دەبێ لە گەرمەی تاقیکردنەوەکاندا مسوڵمانان

لە کەوو بێژنگ بدرێن‌و، دەبێ پاك‌و پیسی مسوڵمانان لێك جیا ببێتەوە، تاکو پاکەکان شتێك بە شتێك بکەن بۆ ئیسلام‌و، پیسەکان حیساباتیان لێ تێك نەدەن، گەندەڵ‌و پووچەکان ڕیزەکانیان شلۆق‌و لەرزۆك نەکەن، ئیشەکەیان لێ پووچەڵ‌و بێ ئەنجام نەکەن!! ئایا مسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا لەبەرچی‌و چۆن تێکشکان خۆ بە قیادەی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، وە هەرکام لە (ئەبووبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی)یشیان لەنێودابوون، ئەدی بۆچی شکان؟

خوای دادگەر هەواڵی پێ داوین‌و وەڵامی ئەو پرسیارەی بە ڕوونیی داوینەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ آل عمران، واتە: بێگومان خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە ڕاست هێنایەدی (کە فەرمووبووی سەرتان دەخەم‌و مەلائیکە دەنێرم بۆ پشتگیریتان) ئینجا دەفەرمووێ: (إِذْ تَحُسُّونَهُم) واتە: ئەوکاتە بێننەوە یادتان، کە لە سەرەتای جەنگەوە کافرەکانتان لە هەست دەخست (دەتانکوشتن)[1].

﴿ ... حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ آل عمران، واتە: یارمەتی‌و

١) (راغب الاصفهاني) لەوبارەوە گوتویەتی: (حَسَسته) یانی: (أصبتُ حاسّتهُ) نحو (کبدته وفأدته) ولما کان ذلك قد یتولد منه القتل عبر به عن القتل، فقیل: حَسَسته أي قتلته، قال تعالی: ﴿ ... إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ آل عمران، بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص٢٣٢.

سەرخستنی خواو گفتو بەڵێنەکەی بۆتان بەردەوام بوو، تاکو خۆتان فەشەلتان هێناو ناکۆکیی کەوتە نێوانتان لە کاروبارداو سەرپێچیتان کرد، دوای ئەوەی ئەو شتەی کە زۆر حەزی لێدەکەن (کە دەستکەوتە) پێشانیدان.

کەواتە بەوە شکستەکەتان دەستی پێکردو لەوکاتەوە سەری هەڵدا، کە بێ فەرمانییتان کردو سەرپێچیتان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، جا لە ئەنجامی ئەو سەرپێچییەدا، ترستان هاتە نێو دڵ، ترسەکەش بوو بەهۆی ناکۆکیی نێو خۆتان، ناکۆکییەکەش بەهۆی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەرەوە بوو ﷺ، سەرپێچییەکەش بەهۆی خۆشویستنی دونیاوە بوو، کاتێك کە جەنگاوەرەکانی سەر شاخۆلکەی تیرهاوێژان (جبل الرماة) بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت (غنیمة) دابەزینو فەرمانەکەی پێغەمبەریان (علیه الصلاة والسلام) شکاند، فەرمان شکاندنو سەرپێچییەکەش ئەوە بوو، کە ئەو شوێنەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دیاریکردبوون، کە شاخۆلکەیەکە لە دامێن چیای سەرکەشی ئوحودەوەو پێی دەگوترێ: (چیای تیرهاوێژەکان) "جبل الرماة" ئەو تەپۆڵکەیەیان چۆڵ کردو هەندێك لە جەنگاوەرە موشریکەکان[1]، کە ئەمەیان زانی، پشتیان لێ برینەوەو چوونە سەر شاخۆلکەکە کە تەنها چەند کەسێك لە هاوەڵانی لێ مابوونەوەو پاش شەهیدکرانیان، سوپای ئیسلام پشتی لێگیراو، لە پێشەوەش ڕا کاتێك سوپای کوفر زانی مسوڵمانان پشتیان لێ گیراوە، دژە هێرشیان کرد، ئیدی

---

١) بە فەرمانی (خالد بن الولید)و (عکرمە بن ابی جهل)، کە ئەو ساتە مسوڵمان نەبووبوون، خوا لێیان ڕازی بێ.

سەرەنجام موسوڵمانان لە شەڕەکەیاندا شکستیان هێنا، بۆچی؟ چونکە بێ فەرمانیی پێغەمبەریان ﷺ کرد.

پێویستە لەو ڕاستییەش بێئاگا نەبین، کە تاقیکردنەوەی خوا "تبارك و تعالی" بۆ هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکان (خوا لێیان ڕازی بێت) بەو بەڵاو ناڕەحەتییەی، کە لە جەنگی (أحد)دا یان لە هەر حاڵەتێکی دیکەدا کە بەسەریان هاتوە، ئەوە ناگەیەنێ، کە خوای بەخشەرو دادگەر، ڕقی لەو بەڕێزانە بووبێت‌و خۆشی نەویستبن، بۆیە ئەوەی بەسەریان هێنابێ.

بەڵکو بە پێچەوانەوە موسوڵمانان تا ئیمانیان‌و دینەکەیان مەحکەمترو تێرو تەواوتر بێت تاقیکردنەوەشیان قورسترو سەخت تر دەبێت، بۆ وێنە: با سەرنجی ئەم فەرمایشتە بدەین لەوبارەوە: ((عن مصعب بن سعد عن أبيه قال: قلت يا رسول الله أي الناس أشد بلاء؟ قال: الانبياء، ثم فالأمثلُ، فيُبتلى الرجل على قدَر دينه..)) رواه الترمذي.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایدەگەیەنێ، کە ڕێژەو ئەندازەی سەختیی‌و قورسیی تاقیکردنەوەی موسوڵمانان بەگوێرەی ڕێژەو چۆنیەتی دینداریی‌و ئیمانەکەیانە، هەر بۆیەش تاقیکردنەوەی پێغەمبەران "عليهم الصلاة والسلام" لە هی هەموو کەس توندترو سەخترە، چونکە بێگومان ئیمان‌و دینداریيەکەشیان، لە هی هەموو کەس چاکترو بەهێزترو کامڵترە.

ئنجا دوای ئەوانیش پلەپلەو پێ بەپێ، هەتا ئیمان مەحکەمتر بێ‌و دینداریی‌و موسوڵمانەتی باشتر دەبێت، تاقیکردنەوەی خاوەنەکەیشی قورسترە، ئایا قوتابی هەتا زیرەکتربێ‌و لە پلەی خوێندندا بالاتر

بێت، تاقیكردنەوەكەیشی قورستر نابێ؟!

دیسان خوای كاربەجێو میهرەبان لەبارەی حیكمەتی تاقیكردنەوەی مسوڵمانانەوە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئایا پێتان وایە (خوا "جل جلالە" بە پرسیاری ڕەخنەگرانە "الإستفهام الانكاري"یەوە دەفەرموێ: ئایا خەیاڵتان وایە بچنە نێو بەهەشت؟! ئەوە بێگومان بەهەڵەدا چوونەو خەیاڵ پڵاوتان كردووە: ﴿ ...وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ البقرة ﴾، مادام جارێ تووشی ئەو ناڕەحەتیی و گرفتارییانە نەبوونە، كە مسوڵمانانی پێش ئێوە تووشیان بوون، جا ئایا تووشی چی بوون؟ ﴿ ... مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ... ﴾ هەژاریی و نەداریی و نەخۆشی و ئازار، وەك پۆشاكی بەدەن چەسپ، پێیانەوە نووساو بەرۆكی گرتن و ناڕەحەت و شپرزەی كردن[1].

١) كەواتە هەم لە ماڵ و سامان و هەم لە جەستەو گیاندارانداا تاقیكردنەوە، وەك لە شوێنێكی دیكە فەرموویەتی: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ... ﴿١٨٦﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ ...وَزُلۡزِلُواْ ... ﴾ وە ڕاشەقێنران، وەك چۆن بێژینگە دەغڵێك بە توندی ڕادەتەکێنرێ، بۆئەوەی کە هەرچی سەرکوێزر (سەرکۆتەڵ)و شتی نامۆیەو ڕەگەڵی کەوتوە، جیا بێتەوەو دەغڵەکە پاك بێتەوە.

ئەو مسوڵمانانەی پێش ئێوەش بەشێوەیەك ڕاتەکێنران و لەبێژەنگ دران کە ئەو ڕاشەقێنرانە، ئەو برسیی بوون و نەخۆش بوون و گرفتار بوونە، هێندە توندو قایم و بەهێز بوو، کە لەژێر تین و تاوو گوشاردا هاواریان کرد، ﴿ ...حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِ ...(٢١٤) ﴾ البقرة، بەڵێ ئەو مسوڵمانانە بە ئەندازەیەك تەنگاوو سەخڵەتبوون و نارەحەتبوون، هەتا پێغەمبەرەکەیان (علیه الصلاة والسلام)و ئەوانەش کە لە خزمەتیدا بوون، هاواریان بردە بەر خوای بە بەزەیی و لێی پاڕانەوەو گوتیان: یارمەتی خوا دەبێ کەی بێ؟

دیارە نائومێد نەبوون لە ڕەحمەتی خوا، بەڵام چونکە تاقیکردنەوەکەیان زۆر قورس بوو، وە زۆری خایاندو کاتی دەروو لێکرانەوەیان نەدەزانی، هاواریان لێ بەرزبۆوە، بەڵام بۆ لای خوا !

جاری واش هەیە خوای کاربەجێ یارمەتی کۆمەڵێك لە دۆستەکانی خۆی نادات و لە دنیادا سەریان ناخات، بۆئەوەی بۆ خەڵکی دیکە ببنە سەر مەشق، چونکە ئەم دنیایە جێی تاقیکردنەوەیەو جێی ئەنجام و بەرهەم وەرگرتنەوە نیە، بۆ نموونە: ئەوانەی کە (أصحاب الاخدود)[1]، شەهیدیان کردن، واتە خاوەنی خەندرکەکان، چونکە وشەی (أصحاب الأخدود) ناوە بۆ کافرەکان، کە مسوڵمانان بڕوایان

---

١) وشەی (اخدود) بەمانای (شقوق) دێت، واتە: کەلێن و درز لە زەویدا دروستکردن، کە لە زمانی کوردیدا (خەندرك)ی پێ دەڵێن.

بە کورە بچکۆڵەکە هێنا، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووەو (مسلم) گێڕاویەتەوە لە (صهیب)ەوە خوا لێی ڕازی بێ.

جا خوای پەروەردگار بەسەرهاتی ئەوانەمان بۆ دەگێڕێتەوە وەك (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە تەفسیری سوورەتی (البروج)دا گوتوویەتی: (بۆ ئەوەی ئەو مسوڵمانانەی، کە دەستیان لە هەموو پچکان دەبڕێتو ئاسۆی سەرکەوتنیش لە هیچ لایەکەوە بەدی ناکەن، کە دەروویان لێ بکرێتەوەو دەرباز ببن، دووچاری نا ئومێدیی نەبنو ئەو مسوڵمانانەی کە سوورەتی (البروج) باسیان دەکات، ببنە سەرمەشق بۆیان)[1].

بەڵێ مەرج نیە ئێمە لە دنیادا هەموو دەمێ سەرکەوتوو بین بەسەر دوژمنداو، دەوڵەت دابمەزرێنینو کیانو قەوارەو هەیبەتێکمان بۆ بڕەخسێ، کە بتوانین بەهۆیەوە شەریعەتی ئیسلامیی بەتەواوەتیی پیادە بکەین، ئەوە مەرج نیەو زۆر لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، هەر بە بێنازییو بە بێکەسییو بە بێدەسەڵاتیی ماونەتەوە، بگرە هەیانە شەهید بووە، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿...وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّۗ ... ﴿٦١﴾﴾ البقرة، خوای پەروەردگار بە (بەنی ئیسرائیل) دەفەرموێ: (پێغەمبەران بە ناهەق دەکوژن) بۆ نموونە: (زکریا) و (یحیی) صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، وە ڕەنگە پێغەمبەرانی دیکەش هەبووبن کوژرابن، ئاشکراشە کە هەمووشیان دووچاری چەندان جۆرە گرفتارییو نارەحەتیی بوونە.

---

١) بڕوانە: (في ظلال القرآن)، ج٦، ص(٣٨٧١ تا ٣٨٧٦)، ط دار الشروق.

**جا مسوڵمانینە!**

لێرەدا حیکمەتی تاقیکرانەوە (إبتلاء)مان بۆ دەردەکەوێ، چونکە هەرکامێکمان لە گەرمەی تاقیکرانەوەو گرفتارییدا دەبێ بەخۆی بڵێ: خۆ تۆ لە پێغەمبەرانی خوا "علیهم الصلاة والسلام" زیاتر نی، بۆ وێنە: (زکریا و یحیی) کە بێگومان خوای باڵادەست زۆر بە سێنایی دەیتوانی سەریان بخات، یان (عیسی) "علیه الصلاة والسلام"، کە نەصرانییەکان بە هەڵە پێیان وایە، کە لە سێدارە دراوەو ئەو خاچ (صلیب)ەکەی کە بە ملی خۆیانیدا دەکەن، بەحیساب ئەوە ڕەمزو هێمای بەدارداکرانو لە سێدارەدانی عیسایە (علیه الصلاة والسلام)، بەڵام خوای پەروەردگار دەفەرموێ:﴿ ...وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ ...(١٥٧) ﴾ النساء، واتە: نە کوشتیانو نە هەڵیشیان واسی، بەڵکو وێنەی (عیسا) برایە سەر کەسێکی دیکەو ئەویان هەڵواسی لە جیاتی (عیسا) "علیه الصلاة والسلام" وە خوای زاڵو مەزن (عیسا)ی کوڕی مەریەمی بە کلاوڕۆژەدا بەرز کردەوەو سەری خست، کەواتە: (عیسا) هەر ئەوەندەی پێکرا، کە خوا بەرەو ئاسمان سەری بخات، وەك خوای بەتوانا فەرموویەتی ﴿ ...بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ...(١٥٨) ﴾ النساء، دەجا خۆ ئێمە لە (عیسا) و (زکریا) و (یحیی) زیاتر نین، کە پێغەمبەرانی خواش بوون "علیهم الصلاة والسلام"، بەڵام خوای کاربەجێ حیکمەتی وا بووە، ئەو زاتە بەڕێزو پایە بەرزانە، نەك هەر بەسەر دوژمنانیاندا سەرنەکەون، بگرە یان شەهید ببن، یان خوا "تبارك وتعالی" بەرزیان بکاتەوە، بەڵێ ئالێرەدایە کە

ماهییەتو جەوهەری ئیمان دەردەکەوێ، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ... ﴿١٠﴾ ﴾ العنکبوت، واتە: کەسانێك هەن کە لە حاڵەتی شێنەییدا دەڵێن: ئیمانمان بە خوا هێنا، بەڵام کاتێك لە پێناوی خوادا ئازاردران (بە هەر جۆرە ئازارێكو ناڕەحەت کران)، ئەوە ئازاردانی خەڵکیشی پێ وەك ئازارو سزای خوا وایە!! واتە لە تەنگانەدا خۆی بۆ ناگیرێت.

نەخێر براو خوشکی مسوڵمان !

خۆت بۆ ئازاردرانەکە بگرەو با ئاگرو تینو تاوی گرفتارییو ناڕەحەتیی لە پێناوی خوادا پاڵفتەت بکات، بۆ ئەوەی تووشی سزای خوا نەبی، لە بەرانبەر گرفتارییەکاندا خۆڕاگربە، بۆ ئەوەی لە ئیمتحانی خوا دەربچی.

هەروەها هەر لەبارەی حیکمەتی بەڵاو گرفتارییەکانەوە خوا فەرموویەتی: ﴿ ... وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖ ... ﴿٤﴾ ﴾ محمد، واتە: خوا ئەگەر ویستبای تۆڵەی لە دوژمنەکانتان دەستاندو ئێوەی بەسەریاندا سەردەخست، بەڵام بۆ ئەوەی هەندێکتان بەهۆی هەندێکتانەوە تاقی بکاتەوەو بتانجەربێنێ.

بەڵێ سزاو جەزرەبەدانو تێکشکاندنی ئەوان بۆ خوا زۆر ئاسانەو هیچی تێناچێ، فریشتەیەك دەنێرێ باڵێکیان لێ دەداتو دەبڕێنەوە، وەك لە هەندێك شوێنەوار (آثار)دا هاتووە، کە کاتێك خوای بەرزو مەزن ویستی گەلی (لوط) علیه السلام، قەڵاچۆ بکات، (جبریل)ی

ناردو ئەویش باڵێکی خستە ژێر ئەو ناوچەیەی، کە ئەو گەلە ڕەوشت نزمەی تێدا نیشتەجێ بوون و، سەرەتا بەرزی کردنەوە بەرەو ئاسمان، هەتا ئەهلی ئاسمان گوێیان لەوەڕەی سەگ و باڕەی بزن و بۆڕەی مانگاکانیان بوو، پاشان لەوێوە نوخونی کردنەوە!! بەڵێ ئەوە بۆ خوا زۆر ئاسانە، بەڵام دەیەوێ بەیەکتر تاقییان بکاتەوە: ﴿...وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ...﴿٤﴾﴾ محمد، جا هەریەکێک غەڵەتێکی کردو خوا "تبارك وتعالى" بە زەویدا بەرێتە خوارو بیفەوتێنێ، ئەدی ئیمانی ئیمانداران چۆن دەربکەوێ؟ ئێمە ئەگەر هەموو ئیشەکان خوای باڵادەست بۆمان بکات، ئەدی بۆخۆمان چین، ئایا دەبێ هەر هەڵخزێین و بڵێین: خوایە فلان کەسمان بۆ لەبەین بەرەو، فلانە شوێنیشمان بۆ تەخت بکەو ئێمەش لەوێ دابنیشین!! بێگومان نەخێر، چونکە ئەوە عادەتی (بەنی ئیسرائیل)ە کە بە مووسایان گوت "علیه الصلاة والسلام": ﴿...فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائدة، واتە: تۆ لەگەڵ پەروەردگارت بچن بجەنگن {یانی شەڕی لەگەڵ (عمالقة) بکەن و (بيت المقدس)یان لێ بستێننەوە}، ئەوە ئێمەش لێرە دانیشتووین (وە چاوەڕێن داخۆ کەی لێ دەبنەوە، جا هەرکات ئێوە لێبوونەوە ئێمەش دێین)[1].

بەڵێ ئەم جۆرە هەڵوێستە ئەوە عادەتی (بەنی ئیسرائیل)ە، بەڵام هەڵوێست و عادەتی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکە خۆم زیادم کردوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست، ئەگەرنا لە دەقی ئایەتەکەدا نەهاتووە.

بوو کە (ئەبووبەکر)و (عومەر)و (سعد بن معاذ)و (مقداد بن الأسود)و هاوەڵانی دیکەش خوایان لێ ڕازی بێ نواندیان، کە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پێشمان بکەوە (ئەگەر ملمان پێ لە دەریا بنێی یەکێکمان پاشەکشە ناکات)[1]، دوای ئەوەی پێش جەنگی (بدری الکبری) ڕاوێژی پێیان کردو پرسی پێکردن‌و فەرمووی: بێگومان ئێمە نەهاتووین جەنگ بکەین - لەگەڵ قورەیشدا بە سەرکردایەتی (ابو جهل)- بەڵکو هاتووین کاروان بگرین بە قیادەی (ابو سفیان)، بەڵام ئێستا شەڕمان بەتووشەوە بووە، جا ئایا ڕەئیتان چیە، بچین یان بگەڕێینەوە ؟!

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بووە، بۆ هەرکارێکی گرنگ ڕاوێژی کردوەو هەر نەچووە پێش خەڵك بکەوێ نەزانێ بۆ کوێیان دەبات ! بەڵکو پێشوەخت مەشوەرەتی پێکردوون، تێی گەیاندوون، ڕۆشنی کردوونەوەو قەناعەتی پێ هێناون، لە پێش ئەوەشدا تەزکیەی کردوون‌و پەروەردەی هەمەلایەنەی کردوون، ئنجا بەگژ دوژمنیدا کردوون، دیارە بۆ خۆیشی لە پێشیانەوە بووە "ڕوحم بە قوربانی بێ" وەك (انس بن مالك) خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: (...وكان ﷺ أشجع الناس) رواه مسلم.

هەروەها لە سەرجەم کتێبەکانی سیرەدا هاتوە لەبارەی ئازایەتی

---

١) (... فأمض يا رسول الله لما أردت فنحن معك، فوالذي بعثك بالحق لو استعرضت بنا البحر فخضته لخضناه معك، ماتخلف منا رجل واحد...) بروانە: (البداية والنهاية)، ج٣، ص(٢٦٢- ٢٦٣)، (السيرة النبوية الصحيحة). ج٢، ص(٥٠٢)

پێغەمبەری خواوە ﷺ كە هاوەڵانی بەڕێزی گوتوویانە[١]: (كاتێك جەنگ گەرم دەبوو خۆمان لە پشت پێغەمبەری خوا ﷺ دەگرت !).

وە لە سیرەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، كە لە جەنگی حونەیندا و لەكاتی دەستپێكردنیدا، بێئەوەی سوپای ئیسلام پێی بزانێ بۆسە (كمین)ێك دانرا بوو، جا كاتێك كتوپڕ بەسەریدا كەوتن، مسوڵمانان شكان، وە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی تەنها مابۆوە لەگەڵ دە دوازدە[٢] نەفەرێكداو دەیفەرموو: (أنا النبي لا أكذب أنا ابن عبدالمطلب)[٣]، واتە: من پێغەمبەرم درۆ ناكەم، من كوڕی (عبدالمطلب)م.

هەروەها كتێبەكانی (سیرة)[٤]، گێڕاویانەتەوەو لە (صحیح المسلم)یشدا هاتوە، كە هەركام لە (عباس بن عبدالمطلب و سفیان بن الحارث) هەردووكیان زۆر توند لغاوی ئێسترەكەیان گرتبوو، كە بە پڕتاو بەرەو دوژمن دەچوو، لە كاتێكدا كە خەڵك شكاوەو هەڵدێن !! بەڵێ مسوڵمانینە!

ئەمانە حیكمەتو فەلسەفەی تاقیكردنەوەن، دیارە بەبێ (إبتلاء)یش ئەو ڕاستییانە دەرناكەون، چونكە لە دەشتێ هەموو كەس ئازایە بۆ ڕۆشتن، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەبەر هەوراز نەوەستن، وەك

---

١) بڕوانە: (السیرة النبویة الصحیحة) ج٢، ص(٣٥٩)، د. ضیاء العمری... تێبینی: ئەو قسەیە هی (سعد)ە.

٢) بڕوانە: (سیرة ابن هشام)، ج٢، ص(٤٤٢).

٣) رواه مسلم.

٤) بڕوانە: (السیرة النبویة الصحیحة)، ج٢، ص(٥٠١).

کوردەواریی خۆمان دەڵێن:"لە بوارێدا لاقی ڕەش و سپی دەردەکەون"، یاخود عەرەب دەڵێن: (عند الإمتحان يكرم المرءُ أو يُهان) واتە: لەکاتی تاقیکردنەوەدا، ئینسان یان ڕێزی لێ دەگیرێ، یان ڕیسوا دەکرێ، یانی: یان قەدری خۆی بەرز دەکاتەوە، یاخود خۆی نزم دەکاتەوە.

هەروەها هەر لەبارەی حیکمەتی تاقیکردنەوەو لە سوڕەتی (التوبة)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ... ﴿١٦﴾ ﴾ التوبة، ئەم ئایەتەش یەکی دیکە لە حیکمەت و سوودو بەرهەمەکانی (إبتلاء) دەخاتەڕووو ئاشکرا دەکات، خوا دەفەرموێ: ئایا پێتان وایە بەوەندە وازتان لێ بهێنرێ و تاقی نەکرێنەوە، کە جارێ خوای پەروەردگار بۆی دەرنەکەوتوون[1]، (دیارە مەبەست دەرکەوتن و کەشف بوونیانە لەسەر ئەرزی واقیع) داخۆ کامەتان بەڕاستی جیهاد دەکەن، وە بەهیچ نرخێك ئامادەنین، کە کەین و بەین بکەن لەگەڵ دوژمناندا و بیانکەنە جێی نهێنیو ڕازو نیازو پشت پێ بەستنیان لە جیاتی خواو پێغەمبەرو بڕواداران و پەیوەندی تایبەتییان ببێ لەگەڵیاندا؟! یانی: تاکو دەردەکەوێ کێن ئەوانەی، کە خۆڕاگرن و تەنازول ناکەن بۆ ئەهلی کوفرو دەڵێن: پەروەردگار پشتیوانمانەو پێغەمبەر ﷺ پێشەوامانەو، برایان و خوشکانی مسوڵمانانیش کۆمەك و پشتی ئێمەن، ئەو کەسانە کێن و چۆنن؟ دەبێ دەرکەون لە مەیداندا و لەسەر ئەرزی واقیع ئاشکرا بن.

بێگومان تەنها لە گەرمەی تاقیکردنەوەو جەڕباندندا و لە کوورەی خەبات و خۆڕاگریی نێو مەیدانی خواپەرستی و خۆنەویستیدا، ئەو

---

١) بێگومان خوای پەروەردگار زانیاری ئەزەلیی بەهەموو شتێك هەیە.

پرۆسەی کەشف بوون‌و پەردە لەسەر لاچوونە ئەنجام دەدرێ، بەڵێ لەکاتێکدا، کە گوشارت دەکەوێتە سەرو نارەحەت دەبی، دەبێ ئازابی مسوڵمان‌و دیندارو خواپەرست بمێنیەوەو، ئامادەبی لەسەر ڕاستە شەقامی خوا بمێنیەوەو، تەسلیمی واقیعی ناشەرعییانە نەبی‌و نەبەزی‌و بەچۆك دانەیەی‌و، دەست نەکەی بە دزەکردن‌و کەین‌وبەین‌و پەنهانکاریی‌و، پردی ژێر بەژێر دروستکردن‌و، تەون هەڵبەستن لەگەڵ ئەملاولادا، بۆ ئەوەی فشارەکە لەسەر خۆت لابەری‌و خۆت دەرباز بکەی!

## ٥- هۆکارەکانی کەوتن لە تاقیکردنەوەدا:

ئنجا ئایا ئینسان بۆچی‌و بەچی لە تاقیکردنەوەدا دەکەوێ؟

خوای پەروەردگار ئەوەشی بە ڕوونیی لە چەندان ئایەتی قورئانێدا بۆ باس کردووین، بۆ وێنە:

لەبارەی هۆکارو شکست‌و تێکشکانی مسوڵمانان لە جەنگی (ئوحود)دا فەرموویەتی: ﴿...حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ...﴿١٥٢﴾﴾ آل عمران، دیارە ئێمە پێشتریش ئەم ئایەتەمان هێنایەوە، لەکاتی باسکردنی حیکمەتی تاقیکردنەوەدا، بێجگە لە ڕستەی کۆتایی: ﴿...مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ...﴿١٥٢﴾﴾ آل عمران، واتە: هەتانە دونیای دەوێ‌و هەشتانە دواڕۆژی دەوێ، کەواتە لێرەدا هۆکارەکانی شکست‌و تێکشکانی مسوڵمانان لە جەنگی (ئوحود)دا وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك بەدوای یەکدا ڕیزیان بەستوە، بەم جۆرە:

﴿ .... حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ... ﴿١٥٢﴾ ﴾ آل عمران.

**کەواتە: (فشل)، کە ئەنجامەکەیە ئەمانە پێشەکی و هۆکارەکانی: (تنازع + عصیان + إرادة الدنیا = الفشل) ناکۆکیی + سەرپێچیی + هەڵبژاردنی دنیا = تێکشکان.**

**کەوابێ: ڕەگەزو ڕیشەو ماك و میکرۆبی شکست و تێکشکانەکەی مسوڵمانان لە جەنگی (ئوحود)دا، پەیوەندیی بە خودی خۆیانەوەیە، نەك بە تەرەفی بەرانبەریان، کەچی ئێمە زۆرجار کە تووشی نسکۆیەك و شکستیی و تێکشکانێك دێین، هەمیشە یەخەی دوژمن دەگرین، هەمیشە خەتا لە ملی وی دەکەین و دەستی خۆمان بە غەیر دەسڕین و، بەردەوام بڕو بیانووی بێ جێ و، پاساوی نامافووڵ بۆخۆمان دێنینەوە کاکە ئەو شکستەمان بەهۆی کەمتەرخەمیی ئێمەوە نەبوو، بەڵکو خەتای فلان و فیسار بوو!! بەلام بێگومان ئەوە پێچەوانەی قورئانە، من تەنانەت ئایەتێکم نەبینیوە لە قورئانێدا کە خوای پەروەردگار شکستی مسوڵمانان پاساو بداتەوە، بەوەی کە دوژمنەکەیان وابووەو چووەو وایکردوە، بەڵکو هەمیشە شکستی مسوڵمانان بەوە پاساو دەدات و بەجۆرێك (تعلیل) و (تحلیل) دەکات، کە بە هۆی کەمتەرخەمیی و هەڵەو ناتەواویی و کرچ وکاڵیی نێوخۆتانەوە، ئەوەتان بەسەر هاتوە، ئەوەتا لەبارەی شکستی جەنگی ئوحودەوە دەفەرموێ:** ﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ

كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾ آل عمران، واتە: ئایا لە جەنگی ئوحودا کاتێك، کە بەڵایەكو موصیبەتێکتان تووش بوو، کە پێشتر دووقاتی ئەوەتان تووشی دوژمنانتان کردبوو، (چونکە مسوڵمانان لە جەنگی بەدردا حەفتا کەسیان لە کافرەکان کوشتو، حەفتاشیان لێ بەدیل گرتن، بەڵام لە جەنگی ئوحوددا حەفتایان لێ شەهید بووو دیلیان نەبوو، چونکە مسوڵمان مەگەر چۆنکایی ئەگەرنا ئامادە نیە تەسلیم بێ!)، جا بۆ هۆی شکستەکە دەفەرموێ: بڵێ لەلای خۆتانەوە شکستەکەتان بۆ هاتو، دوژمنتان بەهۆی خۆتانەوە زەفەری پێ بردن.

بەڵێ مسوڵمانان بەهۆی هێزی دوژمنیانەوە ناشکێن، وەك خوای مەزن بۆی ڕوون کردووینەوەو دەفەرموێ: ﴿...فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾﴾ النساء، واتە: لە دژی دۆستەکانی شەیتان بجەنگن، بێگومان فێڵو پیلانی شەیتان بێهێزە.

بەڵێ دوژمنانی ئەهلی ئیسلام، لەچاو ئەوان بێهێزن، بەڵام بە مەرجێك ئەوان بڕواداری ڕاستەقینە بن، ئایا ئەم ڕۆژگارە مسوڵمانان بۆچی لە بەرانبەر جوولەکەدا بەچۆکدا هاتوونو شکستیان هێناوە؟!! بێگومان ئەوانەی کە لە بەرانبەر جوولەکەدا تێکشکاون ئەوانە مسوڵمانی تێرو تەواو نین، بەڵکو ئەوانە یان مسوڵمانی بەناو مسوڵمانن، کە لە بەرانبەر جوولەکەدا شکستیان هێناوە، یان ئەگەر مسوڵمانیش بن مسوڵمانی تێرو تەواو نین، چونکە بە درێژایی مێژووی ئیسلام، کاتێك مسوڵمانان لەگەڵ دوژمن تێك گیرابن، کاتێك کە زانیوویانە حیساب گەیشتۆتە ئەوەی کە دەست پێ بکەن، مەگەر بە دەگمەن دەنا هەموو جارانو

هەمیشە دوژمن لە هەموو شتێكدا زیاتر بووە لەوان، ژمارەیان، چەكیان، ئیمكانیاتیان، بەلاّم خواش هەر سەری خستوون!! بەلاّم گەلی عەرەب لە سۆنگەی ئەوەوە لە بەرانبەر جوولەكەدا شكستیان هێناوەو، بۆیە دوو سەد ملیۆن عەرەب زیاتریش بە چوار پێنج ملیۆن جوولەكە ناوێرین، چونكە چوار پێنج ملیۆن جوولەكەكە ڕاست دەكەن، جوولەكەی ڕاستەقینەن، بەلاّم عەرەبەكان بە زۆریی مسوڵمانی عادییو زڕن[١]!

لە گۆڤارێكدا خوێندمەوە دەڵێ: لە ساڵی (١٩٦٧)ز دا كە عەرەب بە نسكۆیەكی گەورەی دەزانن، جوولەكەكان بارەگاو بنەكەیەكی عەرەبەكانیان گرت، تەماشا دەكەن لەسەر بارەگاكەیان نووسرابوو:

لا تسأل عن مسلكي أو مذهبي

أنا إشتراكي بعثي عربي

واتە: لە ڕێبازو مەزهەبی من مەپرسە، من عارەبێكی سۆسیالیستیی بەعسییم !

جا دەڵێ جوولەكەكان زەڕبێكیان بەسەردا هێناو، لەسەریان نووسی، واتە: لەسەر هەمان لافیتە: ﴿...كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ...(٢٤٩)﴾ البقرة، واتە: ئەو ئایەتە، كە لە قورئانی ئێوەدایە مەدحەكەی بەسەر ئێمەدا دەچەسپێ، كە

١) بەلاّم كاتێك ژمارەیەكی كەمی مسوڵمانانی ڕەسەنی كەرتی غەززە، لە ساڵی (٢٠٠٨)دا، لەگەڵ جوولەكە زایۆنییەكان ڕووبەڕووبوونەوە، هاوكێشەكە گۆڕا، هێزی پڕچەكو زەبەلاحو نابەرانبەری دوژمن، خراپ لووتی شكا !

هەرچەندە کەمتریشین بەسەرتاندا زاڵ بووین، چونکە ئێمە زیاتر بە قسەی خوامان کردوە، تاکو ئێوە کە خۆتان بە مسوڵمان دەزانن!!

دیارە خوای پەروەردگاریش نەیفەرموە: هەرکەسێك بڵێ: من مسوڵمانم هەر سەریدەخەم، بەڵکو دەفەرموێ: هەرکەسێك ئیماندار بێ سەردەکەوێ، مامۆستا مەلا سەعید نوڕسی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، قسەیەکی جوانی[١] هەیە دەڵێ: (جاری وا هەیە کابرا مسوڵمانە، بەڵام سیفەتی کافرانی هەیە، جاری وایش هەیە کابرا کافرە، بەڵام سیفەتی مسوڵمانانی هەیە، واتە: بابای کافر هەندێك سیفەتی هەیە، کە ئیسلام بە پەسەندی داناون، دەڵێ: کاتێك کە مسوڵمانەکە شکست دەخوات، لەبەر سیفەتە کافرانەکەی شکست دەخوات، نەك لەبەر مسوڵمانەتییەکەی، هەروەها کافرەکەش کە سەردەکەوێ، لەبەر ئەو سیفەتانەیەتی کە باشن نەك لەبەر کافرایەتیەکەی)، بەڕاستی قسەکەی بەجێیە، چونکە بۆ وێنە: برایەتیی شتێکی باشە، مەرکەزییەت شتێکی باشە، هەروەها هەرکام لە ڕاوێژکردنو کاربە بەرنامە بەڕێوەبردن شتی باشو پێویستنو، هەرکامێکیان بابای کافر هەیبێ یان مسوڵمان، ئەوە بەرهەمو شوێنەواری خۆی کەمو زۆر هەر هەیە، پیاوچاك (ولي)ێك بخە نێو ئاوێك، ئەگەر مەلە نەزانێ دەخنکێ، مەگەر خوا وەك (إستثناء)ێكو بەشێوەیەکی (خارق العادة) فوتاری بکات، کافرێکی

---

١) دیارە ئەو مامۆستا بەڕێزە ڕەحمەتی خوای لێبێت (کلیات رسائل النور)ە، دە (١٠) بەرگی یەکەی پڕبەڕە لە قسەی جوانو شیرینو نەستەقو پڕ حیکمەت، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها ئەو قسەیەمان بەو بۆنە (مناسبة)یەوە لێ خواستەوە.

مەلەوانیش بخە نێو ئاوەوە دەپەڕێتەوە، ئەم دنیایە دنیای هۆکارەکان (أسباب)ە، بەڵام مسوڵمانان ئەگەر بڕواداری ڕاستەقینە بن‌و هۆیەکانیش فەرامۆش نەکەن[1]، با هەموو هۆیەکانیشیان بۆ دابین نەکرێت، خوای بە بەزەیی بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە.

کەواتە: ئێمە بەهۆی خۆمانەوەو بەهۆی کەم‌وکوڕیی‌و هەڵەو ناتەواوییەکانمانەوە لە بەرانبەر دوژمندا شکست دەخۆین، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ ... ﴿١٥٥﴾ ﴾ آل عمران، واتە: بێگومان ئەوانەی کە ڕۆژی بەیەکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکە، لە ئێوە شکستیان خواردوو پشتیان لە دوژمن کرد، ئەوە شەیتان هەڵیخلیسکاندن بەهۆی کردەوەکانیانەوە، واتە: بەهۆی گوناحە پێشووەکانیانەوە، شەیتان لە مەیدانداو لە بەرانبەر دوژمنە ئاشکراکانیاندا، چونکە پێشتر پێیان وێرابوو - زەفەری پێ بردن‌و دوژمن بەسەریاندا زاڵ بوو.



١) یەکێك لە خەسڵەتەکانی مسوڵمانی ڕاستەقینە ڕەچاوکردنی هۆکارەکان‌و هەوڵدان بۆ دابین کردنیانە.

## ٦- هۆکارەکانی دەرچوون لە تاقیکردنـــەوە:

وە لــە کۆتاییـــدا ئایــا بەچــی ســەردەکەوین و چــۆن چــۆنی لــە تاقیکردنەوە دەردەچین؟

خوای زانـاو توانـا زۆر بـەڕوونیی و ڕاشکاوانە ئـەو مەسـەلەیەی بـە چەند جۆرێك بۆ باس کردووین، بۆ وێنـە: لـە سووڕەتی (الـمائدة)دا دەفـــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴿١٠٥﴾ ﴾ الـمائدة، واتـە: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! لە خۆتان وریا بن، ئەگەر ئێوە هیدایەت پەیدا کـردووو هیدایەتـدراو بـن و لەســەر ڕاســتە شــەقامی خــوا بــن، ئەوانــەی، کــە گــومڕاو سەرگەردانن، زیانتان لـێ نادەن.

هەروەها هەر لەوبارەوە لە شوێنێکی دیکەدا دەفـەرموێ: ﴿ ...وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ ...﴿١٢٠﴾ ﴾ آل عمران، واتە: ئەگەر ئێوە ئەهلی صەبرو تەقوابن فێڵ و پیلانی ئەوان هیچ زیانتـان لێ نادات. هەروەها لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەوانەی کاتێك کە بەڵایەکیان تـووش دێ دەڵێن: ئێمـە هـی خـواین و وە هـەر بۆ لای ویش دەچینەوە، بەڵێ ئەهلی ئیمان لە تەنگانانـدا ئـەژنۆیان ناشـکێ و نابەزن، بەڵکو دەڵێن: مەرحەبا لە بەڵاو ناڕەحەتیی لە پێناوی دینـی خودادا، مەگەر خوای پەروەردگار پێی نەفەرمووین کە لەکاتی جەنگ و

برسیەتیی‌و نەخۆشیی‌و گرفتارییدا خۆڕاگربین: ﴿...وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾ البقرة، واتە: وە (مسوڵمانانی ڕاستەقینە) ئەوانەن کە لەکاتی نەخۆشی‌و برسیەتیی‌و گەرمەی جەنگدا خۆڕادەگرن، ئەوانە لە مسوڵمانەتییدا ڕاست دەکەن‌و، ئەوانەن پارێزکاران.

بەڵێ خوشك‌و برایانی مسوڵمان !

ئەگەر بێت‌و ئێمە ئەهلی تەقوا بین، واتە: خۆمان‌و ئەوەی کە هەمانە بەهی خوا بزانین، هەروەها بشزانین کە سەرەنجامامان بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، هیچ دوژمنێك پێمان ناوێرێ، چونکە ئەوپەڕی هەر ئەوە نیە بکوژرێین، دەجا مسوڵمان کوژرانیشی لە جەنگدا هەر سەرکەوتنە، بەپێی فەرموودەی خوا: ﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ... ﴿٥٢﴾﴾ التوبة، واتە: "ئەی موحەممەد ﷺ" بە ئەهلی کوفر بڵێ: (جگە لە یەکێك لە دوو شتە هەرەچاکەکان، چی دیکەمان لێ چاوەڕوان دەکەن؟!) کە بریتین لە سەرکەوتن یان شەهیدیی، کە بێگومان یەك لە یەکی چاکترن.

ئینسان بەسەر دوژمندا سەرکەوێ بۆ ئەوەی ئیسلام‌و ئاڵای ئیسلام‌و بەیداخی خوا بەیەکگرتن (علم التوحید)، بەرز بکاتەوەو دینی خوا ببێتە بەرنامەی ژینی خەڵك‌و، شەریعەتی خوا ببێتە سێبەری کۆمەڵگاو لە سایەیدا بەختەوەر بن‌و، تەبا بن‌و، ژیان بەرەو پێشەوە بچێت‌و، بەها بەرزەکان (الفضائل) بڵاوبنەوەو، خەسڵەت‌و خووە نزمەکان (الرذائل) لە بەین بچن‌و، دادگەریی بچەسپێ‌و زوڵم

لابچێ، ئەوە بێگومان ئامانجێکی بەرزەو خەڵاتو بەخششە، ئنجا ئەگەر ئەوەش نەبێ، خۆ شەهیدییەکە هەر مسۆگەرەو وەك گوتراوە: (إما النصر وإما الشهادة). یان سەرکەوتن یان شەهیدیی.

جا بەرێزان !

هۆیەکانی دەرچوون لە تاقیکردنەوە، پێچەوانەی هۆیەکانی شکستو دەرنەچوونو لە تاقیکردنەوەدا کەوتنن، واتە: ئەگەر ئینسان بەهۆی بێ ئیلتیزامیی خۆیەوە شەیتان زەفەری پێ دەباتو بەرەو کەوتنو تێکشکانو دۆڕاندنی دەبات، ئەوە بێگومان هەر بەهۆی ئیمانو تەقوای خۆیشییەوە، خوا بە دەنگییەوە دێو، لە تاقیکردنەوەکانی ژیانی دنیا دەردەچێو، سەربەرز دەبێ، دیارە لێدەرچوونی ئیمتیحانیش هەر ئەوە نیە، کە حەتمەن بابای مسوڵمان، یان کۆمەڵێ مسوڵمان، لە مەیدانی بەرەنگاربوونەوەو روبەڕووبوونەوەدا، زاڵ بێتو جەنگەکە بباتەوەو، هەر لەم دەرفەتەی ژیانی دنیادا سەرجەم ئامانجەکانی بهێنرێنەدی، نەخێر، بەڵکو سەرکەوتنو بردنەوەی ڕاستەقینەو بە ئامانج گەیشتنی تەواو ئەوەیە، کە لە شەریعەت لانەدەی، وەك (أبو علي الجرجاني) کە یەکێکە لە زاناو خواناسە گەورەکان، قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ: (کەرامەت بریتیە لە ڕاوەستاویی لەسەر شەریعەت)، بەڵێ، گەورەترین کەرامەتو ڕێزی خوا بۆ بەندەی خۆی ئەوەیە، کە نەیێڵێ لەسەر جادەی شەرع لابداتو بیپارێزێ، نەك فڵانەکەس بفەوتێنێو فڵان شوێن بگرێ !!

بۆیە دەبینین خوای بەرزو مەزن لە سووڕەتی (الصف)دا بەشێوەیەکی لاوەکیی، باسی بەسەر دوژمندا سەرکەوتن دەکات، بەڵام

زۆر بە تەئکیدو وەك ئامانجێکی سەرەکییو گەورە باسی لێبوردنی خواو چوونە بەهەشت دەکات، کە دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ ... ﴿١٣﴾ ﴾ الصف، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئایا بازرگانییەکتان پیشان بدەم، کە لە ئازارێکی بەئێش فوتارتان دەکات؟! ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن، وە لە ڕێی خوادا بە ماڵو گیانتان جیهاد بکەن، بێگومان ئا ئەوەتان بۆتان باشترە ئەگەر بزانن، چونکە لە بەرهەمی جیهاددا، گوناحەکانتان بۆ دەپۆشێو دەتانخاتە باخاتێکەوە، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆنو، چەند خانووبەرەیەکی پاكو پەسەند لەنێو چەند باخێکی هەمیشە تەڕو پاراودا، ئا ئەوەیە سەرفرازیی مەزن، بەرهەمێکی دیکەش هەیە حەزی پێ دەکەن، یارمەتییەك لە خواوەو دەرووکرانەوەیەکی نزیك..

بەڵێ خوشكو برا مسوڵمانەکانم !

خوای بەخشندەو بەخشەر دەفەرموێ: لە سایەی ئیمانو جیهادەوە لێتان خۆش دەبمو دەتانخەمە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خۆمەوە، ئای، چ نیعمەتێکی گەورەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوە عەفووم کردن، ئەوە هەڵەو گوناحەکانم لێ سڕین، ئەوجا بڕۆن بچنە بەهەشت !!

پاشان خوای بەخشەرو بە بەزەیی ئەو چوونە بەهەشتە ئاوا پێناسە دەکات: ( ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ) ئەوەیە بە ئامانج گەیشتن‌و بەمراد گەیشتنی گەورە، پاشان دەفەرموێ: (وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَا) بەهۆی ئیمان‌و جیهادەوە شتێکی دیکەیشتان دەست دەکەوێ، شتێکی دیکە ئێوە زۆر حەزی لێدەکەن، بەڵام لای خوا ئەو ئەمیەتەی نیە، زانایانی تەفسیر دەڵێن: ئەو جۆرە تەعبیرە لەو سیاقەدا ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو شتەی دیکە لەلای خوا ئەو بایەخ‌و ئەمیەتەی نیە لەچاو لێبوردن‌و بەهەشتدا، بەڵام خۆتان حەزی لێ دەکەن‌و خۆشتان دەوێ: ئەویش برتییە لە: (نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞ)، واتە: یارمەتییەکتان لە خواوە بۆ دێ‌و، دەرووی خێرتان لێ دەکرێتەوەو، دەروازەی وڵاتتان بۆ ئاوەڵا دەبێ‌و ئایین‌و شەریعەتی خوا بەرپا دەکرێ.

جا خوشك‌و برا مسوڵمانەکانم!

بەڕاستی مسوڵمانان وەك لە سەرەتاوە گوتمان ئێستا لە تاقیکردنەوەدان، بەتایبەتی مسوڵمانانی کوردستان‌و عێراق، لەژێر تەجرەبەیەکی سەختداین، بۆیە با لە خۆمان وریا بین، لە هۆیەکانی شکست‌و کەوتن لە تاقیکردنەوەدا، وریاو بێدار بین‌و لە خۆمانیان دوور بخەینەوە، با ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی سەربەرزانە دەرچوونمان لە تاقیکردنەوە، دابین بکەین‌و لە خۆمانیاندا کۆبکەینەوە، با دڵنیاش بین، کە داهاتووی پرشنگدار، تەنها بۆ شەریعەتی تێرو تەواوو دادگەرو بەهێزو پێزی خوایە، بەپێی ئەو وەعدو بەڵێنانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ داویانە، وەك خوای

بالادەست دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الصف، واتە: دەیانەوێ بە فووی زاریان ڕووناکی خوا بکوژێننەوە، بەڵام خوا ڕووناکیی خۆی هەر تەواو دەکات، هەرچەندە کافران قەڵس بن.

بەڵێ، خۆ ئەگەر نەك هەر عەلمانییە پەڕگیرو داخ لە دڵەکانی کوردستان‌و عێراق، بەڵکو ئەگەر هەرچی عەلمانییەکانی دنیان‌و هەموو ئەوانەی کە ڕێی غەیری خوایان گرتوە، خڕببنەوە، چرای دینی خوایان پێ ناکوژێتەوەو، نووری خوایان پێ خامۆش ناکرێ، دیارە ئەوەش خوا "تبارك وتعالى" وەك ڕاستییەك ڕایگەیاندوەو، وەك موژدەیەکیش گفتی داوە، کە ئەگەر ئێمەش ئامادەی جیهاد نەبین، خوای زاڵ‌و بەرز، ئێمە لادەبات‌و کۆمەڵێکی دیکە دەهێنێ: ﴿ ...وَإِن تَتَوَلَّوْاْ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾ محمد، واتە: ئەگەر ئێوە پشت بکەنە جەنگ‌و جیهادو مشوور لێخواردنی ئایینی خوا، ئەوە خوا بە کۆمەڵێکی دیکە دەتانگۆڕێ، پاشان ئەوان وەك ئێوە کەمتەرخەم‌و ساردو سڕ نابن.

کەواتە با پێمان وانەبێ، کە ئێمە وەك لایەنێك‌و تەوژمێکی ئیسلامیی لەلایەن خوای گەورەوە گرەنتیمان پێدراوەو، تازە هەر شتێك بکەین، هەر لەلای خوا خۆشەویستین، مادام ناوو شۆرەتی ئیسلامییمان هەیەو، عەلەم‌و دروشمی ئیسلاممان بەرزکردۆتەوە.

هەروەها مامۆستا (مەلا) بەڕێزەکان‌و (شێخ)ە دڵسۆزەکان‌و صۆفی‌و سەلەفیی‌و سەرجەم مشوورخۆرانی دیکەش، بابزانن کە هیچکەس گرەنتی (ضمانة)ی نەدراوەتێ، کە بڕۆ هەرچی دەکەی

بیکە، تازە تۆ ڕێزو پایەت هەر بەرزو پارێزراوە! بگرە تەنانەت ئەوە نەدراوە بە پێغەمبەریش ﷺ، خوای بە بەزەیی بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ ...لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الزمر، واتە: ئەی پێغەمبەر تۆش ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی ئەوە بە تەئکید کردەوە چاکەکانت هەڵدەوەشێنەوەو لە زیانباران دەبی!

هەڵبەتە خوای کاربەجێ زانیویەتی کە ئەوە مەحاڵە، بەڵام ویستوویەتی ئێمەومانان تێبگەیەنیو هۆشیار بکاتەوە !

بەڵێ مسوڵمانینە !

هیچ کەس گرەنتیو زەمانەتیی ئەوەی نەدراوەتێ، کە: بڕۆ مادام ناوت لەخۆت ناوە ئیسلامییو ڕیشێکت هێشتۆتەوە، یان پۆشاکێکی ئیسلامیت پۆشیوەو، دروشمو نیشانەیەکی ئیسلامەتییت لەسەر سەری خۆت بەرز کردۆتەوە، تازە تۆ قەڵەمی خەتاو گوناحو هەڵە نووسینت لەسەر هەڵگیراوە، نەء، بەڵکو تۆ مادام ناوت لەخۆت ناوە (ئیسلامیی)، دەبێ زۆر وریا بیو ئیسلام چۆن دەڵێ دەبێ وابی، ئەگەرنا خوای دادگەر تۆ لادەباتو کۆمەڵێکی دیکە دێنێت، چونکە بێگومان خوای بێ نیازو بێ باكو تاك، یەکی لەسەر هیچکەس نەکەوتووە ناکەوێ، ئەگەر بێتو ئێمە ئەرکی شەرعیی خۆمان مەردانە جێبەجێ نەکەین، بە تەئکید خوا ﷻ کەسانێکی دیکەو کۆمەڵێکی دیکە دێنێ، کە لە ئێمە باشترو ڕاسترو ساغتربنو، وەك بۆ ئایینو بەرنامەی خوا "جل و عز" شایستەیە، کار بکەنو مشوور بخۆن.

ساخوایە بە کەرەمو بەخششی بێ سنووری خۆت لەو کەسانەمان بگێڕی کە بەشێوەیەك دینداریی دەکەنو بەڕێوە دەچن، کە جێگای ڕەزامەندیی تۆیەو، تۆفیقمان بدەی کە وەك بۆ خۆتو پێغەمبەرەکەت ﷺ و شەریعەتە بێ هەڵەو پەڵەکەت شایستەیە، کاربکەینو بجووڵێین، بۆ ئەوەی موستەهەقی ئەوە نەبین، کە لە مەیداندا لابدرێینو بە کەسانی دیکە بگۆڕرێین.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون.

وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين

پێداچوونەوەی بۆ چاپی دووەم: ٢٠١١/٥/٢١ هەولێر.

# بەرهەمەکانی دانەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خــوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەوچۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩

<u>تێبینی</u>: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

٨- ڕێگای صاڵح بوون‌و بەرەو خوا چوون. چاپی ٣ /٢٠٠٥

<u>تێبینی</u>: وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی‌و لەژێر چاپە .

٩- کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سۆزی نەتەوایەتی‌و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥

١٢- مسوڵمانی کامڵ/بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١٩٩٧/١

<u>تێبینی</u>: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان‌و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان‌و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئایندەیەکی گەش‌و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلامو کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتی، پاكوخاوێنی .

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشینو زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەجو عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەڕانەوە بۆ لای خوا ﷻ . چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن ؟! چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یە، بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٩- بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاساوو بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵیی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣٣- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆر حسین محمد عزیز). چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك. چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٣- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

٤٤- ئیسلام‌و مسوڵمانەتی‌وكاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامی چی‌یەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەكگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتی دا. ١٣ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٧- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەكگرتن لە ناوو سیفەت‌و لە پەرستراوێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٨- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەكانی خوا (عزّوجل)، كتێبەكانی خوا (عزّوجل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٩- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥٠- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندیی‌و دیدو بۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠. چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥١- تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەكانیان. چاپی ١/ ٢٠٠٧، چاپی ٢/ ٢٠١١.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتی)و ئەوەی دیكەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە.

٥٢- گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی‌و لاسایی كردنەوەدا.

٥٣- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟

٥٤- سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونكردنەوەیەك.

٥٥- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ‌و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی.

٥٦- چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی.

٥٧- قوتابیانی زانیاری شەرعیی چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك.

٥٨- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە.

٥٩- بانگەواز بۆ لای خوا .

٦٠- قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!

٦١- ضیف و قضیة (مقابلة مع قناة العربیة). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

٦٢- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

٦٣- خواناسیی، ئایین ، ئیمان. چاپی ٢ / ٢٠٠٩ .

٦٤- واقیعی هەرێمی کوردستان ...دیدێکی ئیسلامییانە. چاپی ١/ ٢٠٠٨ .

٦٥- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا. چاپی ١ /٢٠٠٨

٦٦- چۆن باشتر لە کتێبی بەڕێزی خوا بەهرەمەند دەبین؟! چاپی ١/ ٢٠٠٨، چاپی ٣ /٢٠١٠

٦٧- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵ دا.

<u>تێبینی</u>: ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٦٨- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چاپی ١/٢٠١٠، چاپی ٢/ ٢٠١١.

٦٩- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا .

٧٠- کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك.

٧١- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك.

٧٢- مەلای گەورە کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك.

٧٣- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان .

٧٤- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئان دا.

٧٥- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الأول.

## ئەو بەرهەمانەی لەژێر چاپن

١، ٢، ٣، ٤، ٥- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الثاني والثالث والرابع والخامس.

٦- خاتوو عائیشە دایکی بڕواداران.

٧- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟!

٨- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی ٣.

٩- ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و ...

١٠- بەرگی یەکەمی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، کە سوورەتی (الفاتحة و البقرة)ی گرتۆتە خۆی.

## ئەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن.

١- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد ٦و٧و٨ .

٢- خووو ڕەوشتی ئیسلامیی.

٣- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا. بەرگی دووەم.

٤- گرنگی و پێویستی پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە.

٥- ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی.

